# كڵپەی دەروون

**گوڵبژێرێك لە شیعرەكانی**

**مەلا عەبدولڕەحمانی فاتیحی**

**بەرگی دووەم**

**٢٠١٨**

**عەبدوڵلای حەسەن زادە**

**پێشەكیی بۆ نووسیوە**

**ئامادەكردنی**

**خالید فاتیحی**

* ئامادەکردن: خالید فاتیحی

* پێداچوونەوە: مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن زادە

* پۆلێنکردن: ئیسماعیل ڕاجی

* هەڵەچن: عەبدوڵڵا تاهیر

* دیزاین و بەرگ: سدیق عەلی

* ژمارەی سپاردن: ( ٨٩٠ )، ساڵی ٢٠١٥ی وەزارەتی رۆشنبیری

* تیراژ: ٥٠٠ دانە

*لەسەر ئەرکی هێمن فاتیحی چاپ کراوە

* چاپی یەکەم ( ٢٠١٨ )

* چاپخانە. ڕێنما

# پێشەکی

**خاوەنی ئەم دیوانە شیعرە**

دنیای سەردەمی منداڵی و لاوەتیی ئێمە نە بەقەد دنیای ئێستا بەرفرەوان بوو، نە هێندەی ئێستاش خاوەنی کەرەسەی جۆراوجۆری پێوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بوو. بەتایبەتی لە ناوچە سنوریەکانی وەك بانێو سەردەشتو خانێ، تەنانەت جادەی خاکییش جگە لە نێوان شارەکان لە هیچ کوێ نەدەبینراو لەوانیش‌دا بە کەمی ترۆمبێل هاتوچۆیان دەکرد. بەوحاڵە هاتوچۆی قوتابیانی ئایینی کە ئەمن و مەلا ڕەحمانی فاتیحی خاوەنی دیوانی "کڵپەی دەروون"یش لەوان بووین، ئەو دنیایەی بەرتەسکتر کردبۆوەو دەکرێ بڵێم بەشێکی زۆر لە مەلاو فەقێیەکان دووراودوور یەکتریان دەناسی. دووسێ ساڵ بوو ناوبانگیم بیستبوو، هەتا ساڵی ١٣٣٥ی هەتاوی (١٩٥٦)ی زایینی، (٦٠) ساڵی ڕەبەق پێش ئەمڕۆ لەگوندی "ترکەش"ی ناوچەی "بەری مێرگان" چاوم پێی کەوت. وا دیار بوو ئەویش ناوی منی بیستبوو، چونکە لە یەکەم دیداردا وەك دوو دەستەبرا دەگەڵ یەك بەرەوڕوو بووین. ئەوەی لەسەریم بیستبوو لە لاوچاکی، ڕوح سووکی، خۆش مەشرەفی و دەنگخۆشی هەمووی بەزیادەوە ئەوە بوو کە بەر گوێم کەوتبوو. بەزمی ڕووتی بەناوبانگە. دنیای فەقێیایەتی کە پڕ بوو لە هەژاری و نەداری لە "قەلەندەرخانە" کانی دا فەزایەکی شادی پێك هێنابوو. ڕۆژانی سێ شەممەو هەینی کە پشووی حەوتووانە بوون، فەقێی چەند دێی لێك نزیك وەسەر یەك

دەکەوتن و بەزم و ئاهەنگێکیان ساز دەکرد کە خەڵکی خواپێداویش ئێرەیی پێ دەبردن. ئەو دەمانە وشکەداوەتێکیان دەگرت کە کورد گوتەنی کەچکی تێ نەدەگەڕا. بۆ ئەو کارە بەزمگێڕو گۆرانیبێژیش هەر لەخۆیان بوون. هەرچەند کەم وزۆر هەمووان لەو مەیدانەدا خۆیان تاقی دەکردەوە، بەڵام فاتیحی سەرتۆپی هەمووان بوو. چبۆ بەزمی مەجلیسو چبۆ گەرمکردنی کۆڕی وشکەداوەت، هەتا ئەو دیار بایە حەیف بوو داوا لە کەسی دیکە بکرێ. لەو بوارەدا مەلا ڕەحمان زۆر بەهرەمەند بوو. وەك هەموو هونەرمەندێك بەشێك لە شێعرەکانی فۆلکلۆری بوون. بەڵام لەبارەی هەر بابەتێکەوە بیویستایە بە لووزەو شێعری بۆ دەهات و کانیاوی زەوقی وشکایی نەدەهات. هەر ئەو بەهرەیە بوو کە دواتر مەلا ڕەحمانی هێنایە مەیدانی شێعرو شاعیری. خوێنەری "کڵپەی دەروون" دەبینێ کە شێعرەکانی فاتیحی شێعری عەرووزینو ڕەنگە هێندێ لە خوێندەوارە لاوەکانمان تێرچێژ نەکەن. بەڵام بەڕاستی نەك هەر بۆ هاودەورەکانی، بەڵکوو بۆ هەموو ئەوانەی پێوەندیی نزیکیان بە کۆمەڵی کوردەوارییەوە ماوە، چێژو تامو بۆنێکی ڕەسەنی کوردەواری دەبەخشن. فاتیحی لە زۆر بواردا قەریحەی خۆی تاقی کردۆتەوە. ئەو کە ئاوێتەی خاك و ئاوی کوردستانە ئەگەر دێتە سەر وەسفی سروشتی نیشتمانە جوانەکەی و شاخ و کێوو چڕوچێوو گوڵ و گیاو باڵندەو پێڕۆیەکانی، ئەوەندەی پێیە قەتی لێ نابڕێ، ناکرێ شاعیر دڵی هەبێ و دڵداری بووبێ و دڵداریی تاقی کردبێتەوەو شێعری دڵداری نەڵێ. لەو بارەیەشەوە

نیشانەکانی ئەوینێکی پاك لە بەرهەمەکانیدا بەدی دەکرێن. کاتێکیش نۆرە دەگاتە شێعری نیشتمانی و خەباتگێڕانە تێدەگەی بەڕاستی ئاشقی گەل و نیشتمانەکەیەتی و بەدڵەوە بۆیان دەسووتێ. لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە لە پشتی هەموو بابەتە شێعرییەکانی شاعیرێکی ڕاستگۆو دڵسۆزو بێ فیزو ئیفادە هەست پێدەکەی.

خوێنەری هێژا! ئەمن نە شاعیرم و نە شێعرناس. مەبەستم لە نووسینی ئەم کورتە بابەتە هەر ئەوە بوو بە بۆنەی دەرچوونی دیوانەکەیەوە یادێکم لەو برایەم کردبێتەوە کە تا ئەو ڕۆژەی دێوەزمەی مەرگ بە ناوەخت لە بنەماڵەکەیو لە منو دۆستو برادەرەکانی هەڵبڕی، قەت پێوەندیمان نەپچڕاو هەرگیز دڵمان لێك دانەبڕا. ناسین و داوەری لەسەر دیوانی فاتیحی بۆ خۆتان بەجێ دێڵم. لەکۆتاییدا نامەوێ بیشارمەوە کە لە پاڵ خۆمدا ماوەیەکی زۆر لە کوڕەکانی کە بەخۆشی یەوە "گیا لەسەر پنجی خۆی دەڕوێ" ئەوانیش ئەدیبو بە بەهرەن، بەگلەیی بووم و یەك دوو جاریش وەگوێم هەڵێنابوون کە چۆنە غەمی چاپی شێعرەکانی باوکیانیان لەبەر نیە. ئێستا کە دەبینم پرتەوبۆڵەکەم کاری خۆی کردوە زۆری پێ خۆشحاڵمو بە بەشی خۆم سوپاسیان دەکەمو پیرۆزباییان لێ دەکەم.

عەبدوڵڵا حەسەنزادە

١٣٩٥ی هەتاوی ( ٢٠١٦ی زایینی )

## ژیاننامەی فاتیحی

ناوی تەواوی فاتیحی (عەبدولڕەحمانی کوڕی عەبدولکەریمی کوڕی عەبدوڵلا)یە، دایکی ناوی (زینەت) بووە، لە سالی(١٩٣٠) لە گوندی(یارئالی) ناوچەی گەورکی موکری سەر بە شارستانی مەهاباد لەخێزانێکی جوتیار لەدایکبووە، سێیەم مندالی خێزانەکەی بووە، سێ براو خوشکێکی هەبووە بەناوەکانی (غەفوور، عەلی، مستەفاو مریەم). پێشتر مالەباوانی لە گوندی (نەجنەی سەروو)ی سەر بە شاری بانە، بەهۆی کێشەی کۆمەلایەتییەوە ناچاردەبن ئەوێ بەجێبهێلن‌و بچنە گوندی (یارئالی)و دوای چەند سالێك ئەوێ جێدەهێلن‌و روودەکەنە دەڤەری (لاجان)ی پیرانشارو لە گوندی (سۆغانلوو) دەگیرسێنەوە. لە تەمەنی پازدە سالیدا دەچێتە حوجرەو لە لای مامۆستا (عەبدوللای سولەیمانی) دەستدەکات بە خوێندنی سیپارە، دوای خوێندنی قورئان و گولستانی سەعدی، دەچێتە گوندەکانی (تورجان)و (بوغدەکەندی)و (قەرەگوێز)و (حەمامیان). هەر لە درێژەی خوێندنیدا زۆر جێگای دیکەش دەگەڕێ وەکو بۆکان و سەردەشت و گوندەکانی (بێوران)و چەند شوێنێکی دیکەش.

فاتیحی لە ژیانیدا زۆر کوێرەوەریو چەرمەسەری دیتوون‌و زۆر بەهەژاری ژیاوە. سەبارەت بەمەش گوتویەتی: (جارێکی چوومەوە مالێ مامم جوتێك کالەی بۆ کڕیبووم، بەلام دلم نەدەهات لەپێیان بکەم. رۆژە رێیەك بەپێیان رۆیشتووم کاتێك گەیشتوومەتە نزیك ئاوایی، ئەوجا لەپێم کردوون، دەنا هەر بەپێخواسی دەڕۆیشتم. بۆئەوەی کالەکانم کۆن نەبن). فاتیحی دەنگیشی خۆشبووە، دەیگوت: (جارێکیان مەلایەك ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرت، ئەوکاتیش باوبوو، دەبوایە سێ شەوو رۆژان ئاهەنگ و شایی بایەو شایەر بانگ دەکران. لەو ئاهەنگەدا عەلی خەندانی هونەرمەند بەشدار دەبێ و بەیەکەوە گۆرانی دەلێن. پاشان عەلی خەندان دەلێ: (فەقێ رەحمان) بۆچی واز لە فەقێیایەتی ناهێنی و نایە لای من، وەللاهی قازانج

دەکەی). زۆربەی گوندو حوجرەکانی دەڤەری پیرانشارو سەردەشت و بۆکان گەڕاوە بۆ خوێندن. جاری وا هەبووە بە سالیش نەگەڕاوەتەوە ماڵێ. بۆیە کاتێك بە سەفەر دەگەڕێتەوە گوندی سۆغانلوو، دەبینێ ماوەیەکی زۆرە باوکی کۆچی دوایی کردووە، ئەوەش کاریگەری زۆر لەسەر هەستی دادەنێ و دەبێتە خەمێکی گەورە.

لەو سەردەمەدا حوجرە، ناوەندی جۆشدانی بیری نەتەوەیی و برەودان بە زمانی کوردی دەبێ، زۆربەی ئەو مەلاو فەقێیانە هەڵگری بیری نەتەوەیی دەبن و تێکەڵ بەو رەوتە کوردایەتیە دەبن، کە لەو سەردەمەدا حزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران رێبەرایەتی دەکرد. ئەویش دەبێتە ئەندامی حزبی دێموکرات و درێژە بە کاری رێکخراوەیی خۆی دەدات.

دیوانە شیعری شاعیران کە تاکوتەرا لە کوردستانی باشوورەوە دەهاتن بە دزیەوە دەنووسرانەوەو دەست بەدەست دەگەڕان، لەبەرئەوەی لە سەردەمی رژێمی پاشایەتی کتێبی کوردی قاچاغ بوون. لە سالانی (١٩٥٢-١٩٥٣) بەهرەی شیعری فاتیحی دەگەشێتەوەو دەست بە شیعرنووسین دەکات. تاکە شوێنیش بۆ بلاوکردنەوە، رادیۆی کوردیی کرماشان بوو، کە زۆربەی شیعرەکانی بۆ ئەوێ ناردووەو لەلایەن شوکرڕوللای بابانەوە خوێندراونەتەوە. لە سالی (١٩٦١) لە گوندی ئالواتان ئیجازەی مەلایەتی لەسەر دەستی مامۆستا (مەلا نەجمەدینی کەوکەبی) وەردەگرێ. سێ شەوو رۆژان دەبێتە شایی و بەزم و رەزم. لە سالی (١٩٦٣) لە گوندی (دۆلەتوو) دەبێتە مەلاو هەر هەمان سالیش لەگەڵ (ئامینە مەولود قادر) ژیانی هاوسەرگیری پێکدێنێ و بەرهەمی ئەو هاوسەرگیریەش پێنج منداڵی لێدەکەوێتەوە بە ناوەکانی (خالید، ئایشە، کاوە، تریفەو هێمن).

لە سالی (١٩٦٥) کە لە گوندی (چەکۆ) مەلا دەبێت سەرژمێری گشتی دەکرێ، زۆر لەگەڵ کارمەندانی (نفووس) باری کەسێتی دەکات کە نازناو (شۆرەت)ی فاتیحی بۆ

بنووسن بەلام ئەوان گوێی نادەنێ و بە ئارەزووی خۆیان شۆرەتی (ئاشووفتە)ی بۆ دەنووسن.

سالانی (١٩٦٧-١٩٦٨) کاتێك رژێمی پاشایەتیی دەستدەکا بە گرتنی ئازادیخوازان، بێگومان مەلا عەبدولرەحمانی فاتیحیش بێبەش نابێ و لەلایەن (تیمسار ئووەیسی) فەرمانی گرتنی دەردەچێ و دەگیرێ و بۆ زیندانی (جلدیان) دەگوازرێتەوەو دوای ماوەیەك زیندانی، ئازاد دەکرێ. بەلام ترسی ئەوەی دەبێ کە وازی لێنەهێنن و دووبارە بیگرنەوە. بۆیە لە شەوێکی پایزیدا خرت و پرتەکەی کۆدەکاتەوەو لە گوندی (داوداوە)، سنوورە دەستکردەکە دەبەزێنێ و دێتە گوندی(شێنێ)ی باشووری کوردستان. پاشان دەچێتە گوندی (زێوکە)ی دەڤەری پشدەرو دەبێتە مەلای ئاوایی. لەوێ لەگەڵ شاعیری میللی (حەمەپۆلا)ی هاوڕێی یەکدەگرنەوە. کاك حەمەپۆلا ئێستاش دەگێرێتەوە: (شەوانە، دوای نوێژی خەوتنان لە مالی مامۆستا دادەنیشتین و باسی سیاسەت و ئەدەبمان دەکرد. کابرایەك هەبوو ناوی (مام رەسوو) بوو، هەموو شەوێك دەهات و مەجلیسەکەی دەکردە ئی خۆی، تەنیا باسی سە زەردی دەکرد، کە چ سەگێکەو حەریفی چەند گورگانە، شەوێك نەبوو دوان نەبوو، گوتم وا بڕوا دەری ناهێنێ، شەوانە ئەگەر دەهات دوای سەعاتێك دەمگوت: مام رەسوو نەیکەینە شەو؟، دەیگوت کەیفی خۆتە. بۆیە دەرۆیشتین و کە ئەو دەچۆوە مالێ، بامدەدایەوەو دەهاتمەوە لای مامۆستاو تا درەنگانی شەو دادەنیشتن، دوور لە باسی سە زەردی!)

دیسان لە گوندی (زێوکە)شەوە بارگەوبنە دەپێچێتەوەو دەچێتە گوندی (دێلۆ)و لەوێش دەبێتە مەلای گوندو حوجرەو کۆمەلێك فەقێشی دەبن. لەوێش ناچار دەبێ بڕواو بچێتە شاری قەلادزێ و کرێکاری دەکا. پاش ماوەیەك دەچێتە گوندی (شۆڕان) لەوێ کابرایەك مەلای رەمەزان دەبێ. کە مەلا عەبدولرەحمانی فاتیحی دێتە ئەوێ ناچار واز لە کارەکەی دێنێ و دەبێتە مجێور. بۆیە دەلێت:

**ئەمساڵ لە گوندی شۆڕان**

**مەلاو مزگەوت گۆڕان**

**کۆڵنەدەری تووتنەوان**

**بوو بە مەلای رەمەزان**

**وەك مەلای خڕێ بەرداشان**

**بوو بە مجێور لە پاشان.**

**جارێکی دیکەش (شۆڕان) بەجێدێڵێ و دیسان دەچێتەوە قەلادزێ. رۆژی ١٩٧٤/٤/٢٤ کاتێك فڕۆکە جەنگیەکانی رژێمی بەعس شاری قەلادزێ بۆردوومان دەکەن، ئەویش وێڕای خەلکەکە قەلادزێ بەجێدێڵێ و دەچێتە گوندی (سونێ) تا سالی ١٩٧٧ کاتێك رژێمی بەعس گوندەکانی دەڤەری پشدەری راگواست گوندی سونێش بۆ ئۆردوگای تووسووران راگوێزرا.**

**لە سالی ١٩٧٩ کاتێك شۆڕشی گەلانی ئێران بەسەر رژێمی پاشایەتیدا سەرکەوت، شاعیر دەگەڕێتەوە رۆژهەلاتی کوردستان و لە شاری (پیرانشار) دەگیرسێتەوە. لە کاتی هەلگیرسانی شەڕ لە نێوان کۆماری ئیسلامی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، جارێکی دیکەش دەگەڕێتەوە باشووری کوردستان و لە گوندی (کەنجارێ) بە مەلایەتی و توتنەوانی ژیان دەگوزەرێنێ، تا سالی ١٩٩١و لە کاتی کۆڕەوەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ رۆژهەلاتی کوردستان و لە گوندی (گردئاشەوان)دەبێتەوە بە مەلا. تا لە رۆژی یەکشەممە ٢٠٠٢/١١/١٠ کۆچی دوایی دەکات و دەچێتەوە بەرقاپی دلۆڤانی یەزدانی مەزن و لە گۆڕستانی گوندی گردئاشەوان بە خاك دەسپێردرێ.**

**خالید فاتیحی**

# پاڕانەوە

یـا (رسـول الله) دەخـیـلـە، بـێ کـەس‌و سـەوداسـەرم
تـۆی پـەنـاهـی بـێ پـەنـایـان، تـۆی شـەفـیـعـی مـەحشـەرم
بـێ پـەنـام، پشـتو پـەنـاهـم هـەر ئـەتـۆی ئـەی ئـەحـمـەدا
غـەیـری دەرکـی تـۆ مـەحـالـە، دادی خـۆم بـۆ کـەس بـەرم
ڕووت و قووتی دەشتی مەحشەر، هەر مـنـم ئـەی نـووری حـەق
چـاو لـە دەسـتـی تـۆم دەزانـی، هـەر ئـەتـۆی خـەم لابـەرم
عـومـری لاویـم بـا ڕفـانـدی، کـەوتـمـە گـێـژاوی خـەتـەر
بـێ شـعـوورو هـۆش‌وگـۆش‌و، نـاکـەسـی بـەد گـەوهـەرم
ڕووم نـیـیـە بـێـمـە مـەدیـنـەو، زیـارەتـی ڕەوزەت بـکـەم
هـێـنـد گونـەهـبـارو زەلـیـل و، ڕوو ڕەش‌و بـەد ئـەخـتـەرم
ڕووم لـە دەرکـی تـۆیـە هـاتـووم، ژەنـگـی سـەر دڵ لابـەرم
لـوتـفـی تـۆم بـێ لـێـم زیـادە، ئـەی سـەرۆك و سـەروەرم
یـا حـەبـیـبـەلـلا نـەخـۆش‌و دەردەدارم ڕۆژو شـەو
نـیـمـە تـۆشـەی قـەبـری تـاریـك، دەسـت بـە تـاڵو بـێ وەرم
زۆر لـە کـاری چـاکـە دوورم، ڕەحـمـەتـە سـەرکـەوتـنـم
وشـك و ڕەق، بـێـهـێـزو تـاقـەت، چـاو لـە ئـاوی کـەوسـەرم
خـوایـە عـەبـدێـکـم هـەژارو، بـێ مـەتـاع و دەس بـەتـاڵ
بـمـخـە بـەر عـەفـووت، دەنـا بـەم بـارەوە چـۆن دەربـەرم؟
هـەرچـی کـردوویـە لـە دونـیـا (فـاتـیـحـی) بـێ ئـەمـریـیـە
خـوایـە ڕوحـمـی خـۆت بـکـەیـتـە سێـبـەرو تـاجـی سـەرم

**١٩٩٢/٣/٥ گردئاشەوان**

# من دەڵێم

مـن دەڵـێـم دنـیـا بـەتـاڵـە، دەرسـی قـورئـانـم دەوێ
دڵ دەڵـێ جـوانـیـی سـروشـتو، زوڵـفـی پـەخشـانـم دەوێ
من دەڵێم پێم خۆشە حەڵقەی زیکری یەزدان بامیداد
ئـەو دەڵـێ بـۆسـەو کـەنـارو بـەزمـی جـێ ژوانـم دەوێ
مـن دەڵـێـم پـیـرو نـەخـۆشـم نـاگـەمـە جـێ ڕاوی یـار
ئـەو دەڵـێ هـەسـتـە بـڕۆ، بـەو وەخـتـە سـەیـرانـم دەوێ
مـن دەڵـێـم مـزگـەوتـە جـێـگـەم ڕۆژو شـەو گـۆشـەنشـیـن
ئـەو دەڵـێ مـەیـخـانـە خـۆشـە، جـامو فـنـجـانـم دەوێ
مـن دەڵـێـم بـۆ پـیـری وەك مـن خـۆشـە گـۆشـەی خـانـەقـا
ئـەو دەڵـێ بـەزمـی حـەریـفـان، سـازی ڕەنـدانـم دەوێ
مـن دەڵـێـم هـێـنـدەی نـەمـاوە عـومـری فـانـیو بـێ بـەقـا
ئـەو دەڵـێ بـادەو شـەرابو مـاچـی لـێـوانـم دەوێ
مـن دەڵـێـم چـیـدی بـەداوی زوڵـفـی یـاران هـەڵ نـەڵـێـم
ئـەو دەڵـێ تـامـاوە ڕوحـم، مـەدحـی یـارانـم دەوێ
مـن دەڵـێـم دوا سـاتـی عـومـرە، بـەسـیـە وێـڵـیو سـەرسـەری
ئـەو دەڵـێ سـیـنـەی بـلـوورو سـێـوی مـەمـکـانـم دەوێ
مـن دەڵـێـم تـۆبـە هـەزارجـار خـوایـە وا ڕووم کـردە تـۆ
ئـەو دەڵـێ ئـەو جـارە ئـەمـنـیـش، شـیـنو ئـەفـغـانـم دەوێ
من دەڵێم با بەس بێ ئەو جار، ڕوو لە دەرگای حەق دەکەم
ئـەو دەڵـێ بـاشـە، بـەهـەشـت و حـورو غـیـلـمـانـم دەوێ
(فـاتـیـحـی) ئـیـخـلاسـی نـیـیـەت چـاکـە بـۆ ڕۆژی جـەزات
ئـەی خـودایـە مـن لـە لـوتـفـت نـووری ئـیـمـانـم دەوێ

**١٩٩٧/٩/٢٦ گردئاشەوان**

# بگرە دەستم

ئـەی خـودا سـەرگـەشـتـەوو وێـڵـی دیـارم، ڕەحـمـەتـێ
مـاتو مـەحـزونو نـەخـۆشو دەردەدارم، ڕەحـمـەتـێ
غەرقی عوصیان و گـونـاهـی نـەفسی ئـەمـمـارەو هـەوام
چاو بـە ئـەشـكـی سـوێـرو سـوورو دڵ فـگـارم، ڕەحـمـەتـێ
سـەركـەشو چـارە ڕەشو بـێـبـەش لـە نـازو نـیـعـمـەتـم
چـاو لـەدەسـتو خـۆپـەرسـتو نـالـەبـارم، ڕەحـمـەتـێ
وەك هـەتـیـوی بـەر شـەمـالـی ساردی پـایـز بـێ نـەوام
داری بـێ ڕیـشـەو ڕەگـی سـەر كـوهـسـارم، ڕەحـمـەتـێ
پـایـزی عـومـرم گـەڵاڕێـزانـیـەتـی هـاوار لـەمـن
شێوی چاكەم نەبڕی هـەرگیـز، شـەرمـەزارم، ڕەحـمـەتـێ
هـەرچـی كـردوومـە لـە دنـیـا، بـۆتـە تـۆق چـۆتـە مـلـم
بـەو هـەمـوو تـاوانـە زۆرە قـورسـە بـارم، ڕەحـمـەتـێ
بوومە عەبدی ئالقە بەگوێی نەفسو شـەیـتـانـی لـەعـیـن
بـگـرە دەسـتـم سـەركـەوم لـەو گـۆڕی تـارم، ڕەحـمـەتـێ
پیری ئاخیرشەڕ منم، ئەی قوڕ بـەسـەر ئـەمـنـی فـەقـیـر
بـەردی سـووتـاوی ڕەشـی جـێـگـەی هـەوارم، ڕەحـمـەتـێ
بوومە جێگەی تیرو تانـەی سـەرسـەری و ئـەبـلـەو نـەزان
زۆر گـونـاهـبـارو خـەتـاكـارو نـەدارم، ڕەحـمـەتـێ
یا ئیلاهی نیمە تـۆشـەو، ڕێـی نـەجـات بـوون زەحـمـەتـە
گـەنـدەڵـە داری ڕزیـوی بـەرپـەسـارم، ڕەحـمـەتـێ
قـەت لـەكـاری نـالـەبـار نـەمـبـوو پـەشـیـمـان بـوونـەوە
(فـاتـیـحـی) سـەوداسـەرم، گـێـژو هـەژارم، ڕەحـمـەتـێ

**٢٠٠٢/١٠/٤ گرد ئاشوان**

# سکاڵا

ئـەی خـودا هـەر تـۆ خـودای‌و تـۆ وەکـیـلـی مـوتـلـەقـی
تۆی سەبەبـکاری هـەمـوو شـت، بـۆ سـەنـا تـۆذی حـەقـی
غـەیـری تـۆ پـووچ و بـەتـاڵـەو فـانـیـیـە هـەرچـی هـەیـە
هـەر ئـەتـۆ لایـق بـەحـەمـدی، بـۆ سـتـایـش لایـەقـی
ڕوو لە دەرکی هەر کەسێ کـەم، بـێ عـەتـایـەو بـێ کـەرەم
دەرکـی تـۆ ئـاوالـەیـە بـۆ عـاصـیـان، تـۆ ئـەشـفـەقـی
عـومـری لاویـم چـوو بـەبـاداو ژیـنـی پـیـری هـاتـە ڕێـم
ئەی دڵا بەدبـەخـتـی تـاکـەی بـۆچـی وا سـەخـت‌و ڕەقـی؟
ژیـنـی ئـەولا خـۆشـتـرە دنـیـا بـەکـارنـایـەت بـرام
تەرکی دنیاکـە لـە بـەرچـی هـێـنـدە گـێـژو ئـەحـمـەقـی؟
(مانـع الـخـیـر) و هـەلـوعـی، هـەڵ دەلـووشـی پـاکـوپـیـس
ئـاوی کـەوسـەر نـاخـوا، پـیـاوی گـونـاهـکـارو شـەقـی
زاڵمـی، زوڵـمـێ لـەنـەفسی خـۆت دەکـەی ئـەی بـێ حـەیـا
تۆزی بەرپێـی عـاریـفـان بـەو جـان نـیـساری مـوتـتـەقـی
بـەسـیـە ئـیـنـکـاری هـەتـاکـەی تـابـعـی شـەیـتـان دەبـی!!
بـۆ لـە ئـاگـرو مـاری دۆزەخ ئـەی شـەقـی لا یـەتـتـەقـی
لائوبـالـی‌و سـەرسـەری، بـێ عـەقـڵ‌و هـۆش‌و بـێ تـەمـیـز
مـەسـت‌و سـەرشـێـت‌و نـەفـامـە (فـاتـیـحـی) زارو شـەقـی

**گردئاشەوان** ١٩٩٧/١٢/٢١

# دەڵێم هەر دێتە لام ئاغا

## بۆ (عوسمانی وەجاخی)

گوتم قەولی بەمن داوە، دەبێ هەر بێتە لام ئاغا
مەحاڵە گەر نەیەت سەیرە، درۆ ناکا برام ئاغا
دڵم شادە دەڵێم ڕۆژێکی ئەو هەر دێتە سەردانمان
دەکەین سەیران و تەفریحێك، لە سەر چۆم و لە ناو باغا
ئەگەر (قازی) لەگەڵ بێ وەزعەکە خۆشتر دەبێ چونکە
سەفابەخشە برام قازی، لە هەر باغ و لە هەر ڕاغا
لە دۆستێك حالی تۆم پرسی، شوکر بۆخوا گوتی باشە
گوتی لەو بەینەدا دیتم لە (بەیتاس) و لە سابلاغا
ئەتۆ زستانێ فەرمووت دێم، بەهاریش چوو نەهاتی بۆ؟
خەفەتبارە لە نێو قەلبی حەزین و مات و ناساغا
بە لوتف و مەرحەمەت گەربێی، بپرسی حالی ئەو پیرە
وەکو بولبول نەجاتم دێ، لە هاوڕازی قەل و زاغا
دەبێ پێشوازییەکی وات لێبکەم هەرگیز نەدیترابێ
بەگۆشت قاز و قەل و حەیوان، موشەککەل بێ لە یاپراغا
بە پیریش مەیلی لای ئێوەم لە دڵ دەرناچێ باوەڕ کە
بە عەشقی ئێوە گیرۆدەم، وەکو کەشتی لە باتلاغا
ئەوەندەم ئارەزووی دیداری تۆیە، باوەڕم پێ بکە
وەکو پیاوێکی زۆر برسی، لە سفرەی ماست و قەیماغا
بەبێ تۆ چوومە (بوڕهان) و (شەرەفکەند) بۆ تەوافی پیر
وەکو شێر ناوی پیر دیار بوو، لە گۆشەو سووچی بەیداغا
دەزانی (فاتیحی) دۆستێکی دڵسۆز و وەفادارە
دەخیلت بم نەکەی دۆست بی، لەگەڵ پیاوی قوڕمساغا

**١٩٩٦/٦/١٣گردئاشەوان**

**عوسمانی وەجاخی: لە ساڵی ١٩٣٤ لە دایکبووە و لە ساڵی ٢٠٠٢ لە گوندی ئاڵواتانی سەر بە شارستانی سەردەست کۆچی دوایی کردووە. وەجاخی یەکێکە لە شاعیرە زمان پاراوەکانی ئەم دەڤەرە و یەکێك بوو لە هاوڕێ نزیکەکانی فاتیحی. بەڵام بەداخەوە تا ئێستا دیوانە شیعرەکەی چاپ نەکراوە.**

**قازی: مەبەست مەلا قادری نێزەیی یە**

# شۆخی چاومەست

ئـەی کـیـژی شـۆخـی چـاومـەسـت
بـۆ تـۆیـە شـیـعـرو هـەڵـبـەسـت
نــەمــدیــوە کــەس وەکــو تــۆ
عــەیــیــارو جــوانو تــەڕدەســت
مــریــدی دوو چــاوی مــەســت
مــەســتــە بــە جـامـی ئـەلـەسـت
بــە داوی زوڵــفــی خــاوت
دڵــم دەعــەشــقــی تــۆ بــەســت
لــە داخــی بــێــوەفــایــیــت
کـەوتـووم نـەخـۆشو بـێ هـەسـت
ئــەو لــێــوو کــوڵــمــە سـووره
بـەخـۆم نـەبـوو ئـەوم گـەسـت
لــە دووریــت هــێــنــدە گــریــام
ڕژا لــە چـاو خـوێـنـی خـەسـت
پــیــر بــووم لــە دووریــی بــاڵات
عـومـرم گـەیشـتـە لای شـەسـت
بــە شــەهــدی لــێــوو زارت
فــریــوت دام بــە ئــەنــقــەسـت
(فــاتــیــحــی) بــێ زمــانــە
ئـەتـۆ لـێـت کـردووە دەم بـەسـت

**١٩٩٢/١/٢٣ گردئاشەوان**

# پایزی پیری

مووی ڕەشم پاکی سپیو سۆڵە، لەتاوخالی ڕەشت
هێزی ئەعزامی دزیوە، غەمزەیی چاوی گەشت
وەك گەڵاڕێزانی پایز، دێتەخوار فرمێسکی چاو
جارێ نەتفەرموو لەخەمدا، حازرم بۆ هاوبەشت
گێژەڵووکەی پایزی عومرم، ئەوا کەوتۆتە گەڕ
گەرنەیەی بۆ دیدەنیم، حاشا لە تۆ و (قالە ڕەشت)
پەرچەمی قرتاوو، زولفی لوولو خوارت کوشتمی
قەت خەلاس نابێ عیتابو نازو گێرەو قەرقەشت
زۆر نەخۆشم گەر بەلوتفو مەرحەمەت شەو بێیەلام
حازرم بۆ گاو و گەردوونی سوپاەو ئەرتەشت
لاڵو پاڵ کەوتووم لەجێدا، چاوەڕوانی قابیزم
تا نە مردووم با ببینم، بەژنو بالای بێ غەشت
پایزی پیری لە من میوانە، شەوماتو حەزین
دێتە گوێم جارجارە زەنگی جێ هەواری (ترکەش)ت
هێندە شەنگو شۆخو شیکی وەك پەڕەی گوڵ ناسکی
بولبولی دڵ شێتو شەیدایە لەبۆ خونچەی گەشت
بۆ زەکاتی ماچی خۆت نابەخشی بەمنی موستەحەق؟
(فاتیحی) گەردن کەچە بۆ چاوو ئەبرۆی مەهوەشت

**١٩٩٧/١١/١١ گردئاشەوان**

---

**قالە ڕەش مەبەست مەلا قادری نێزەیی هاوڕێیەتی.**

# خۆزگە

خــۆزگــە وەك جــاران دەمــدی جــەمــالــت
دەمــدی جــەمــالــی وێــنــەی ســامــالــت
خــۆزگــە ئــەمســالــیــش وەك ســالــی ســالان
پــەپــوولــە دەبــووم لــە دەوری خــالــت
خــۆزگــە وەك شــەمــاڵ، شــەوو نــیــوەشــەو
ســەرێــك دەهــاتــم بــۆ دەرك‌و مــالــت
خــۆزگــە وەك بــاران لــە فــەســلــی بــەهــار
بــاریــبــامــە ســەر چــیــغ‌و ڕەشــمــالــت
خــۆزگــە بــە دوودەســت گــرتــبــام ســێــوەکــەت
تــێــر بــۆنــم کــردبــان نــارنــجــی کــالــت
خــۆزگــە بــەپــیــریــیــش هــەر لــەلای تــۆبــام
بــەدوو لــێــو گــرتــبــام ســەرگــۆنــای ئــالــت
تــۆ پــیــرت کــردم بــە داخ‌و حــەســرەت
نــەتــپــرســی جــارێــك چــلــۆنــە حــالــت
زۆر پــەشــێــوحــالــم لــە دووریــی بــالات
بــۆچ بــوو بــەقــاتــی وەعــدەی ویــســالــت
خــەتــابــار هــەر تــۆی بــێ شــەرت و بــەقــای
خــوێــن ڕێــژو زالــمــە چــاوی کــەژالــت
چــەنــد دادەڕۆم کــرد چــەنــدم کــرد هــاوار
قــەت نــەتــگــوت بــەســکــە لــە نــالــەنــالــت
پــیــر بــووی (فــاتــیــحــی) تــاکــەی چــاوەچــاو
لــە دەســت خــۆت داوە عــەقــڵ‌و کــەمــالــت

**١٩٩١/٧/٢٥ گردئاشەوان**

# گەڵاڕێزانی عومر

ئـەو ژیـانـە تـرش‌وتـالـە، تـالـە عـەیـنـی ژەقـنـەمـووت
عـادەتــی وایــە، نــەدامــەت تــا بــڕۆی هــەر دێ لــە دووت
نـەگـبـەتـی گـەر شـانـی گـرتـی زەحـمـەتـە دەس هـەڵـگـرێ
وات فشـار داوێـتــە سـەر نـەتـوانـی هـەڵـکـێـشـی پشـووت
چـت لـەدەس نـایـە بـۆ هـەر لایـەك دەچی بـەسـراوە ڕێـت
جا دەبـێ ئـەو ژیـنـە چۆن بـێ نـەتـبـێ قـووتـی لایـەمـووت
ئـەو کـەسـەی کـۆشـك‌و تـەلارو بـالـەخـانـەو قـەسـری بـێـت
خەم مەخۆ ڕۆژێك بـە تـەنـیـا کـۆچ دەکـا دێ ڕووت و قـووت
وا گــەڵاڕێــزانــی عــومــرم هــاتــەپــێــش، بــێــچــارە خــۆم
بار دەکـەن دەورووبـەرم، هـەر دێـن دەڕۆن تـاق تـاق‌و جـووت
مــاڵ‌و ســامــانــت دەبــێــتــە خــاك‌وخــۆڵ، ئـاگـری گـەرم
بـاقـی تـەنـیـا هـەر خـودایـە زاتـی حـەیـی لایـەمـووت
ئـاخـیـری عـومـرەو نـەجـات بـوونـم مـەحـاڵ‌و زەحـمـەتـە
خـوایـە بـمـبـەخشی بـەخـاتـر ئـایـەتـەلـکورسی‌و قـنـووت
شــاری خــامــۆشــان دەمــێــکــە چـاوەڕوانــی مــن دەکــا
بێ زەخیـرەو زادو تـێـشـوو، بـێ عـەمـەل، بـێ بـەرگ و ڕووت
هـەر خـودا بـۆ خـۆی بـکـا روحـمـێ بـەحـالـی (فـاتـیـحـی)
خـۆ دەنـا یـەك زەڕڕە نـیـمـە چاکـە جـاچـۆن بـێـمـە ڕووت
**گردئاشەوان** ١٩٩٨/٥/١٩

# میوانێکی مەردو ڕەند

## (بۆ مەلا ڕەسوڵی نەوزادی)

سـلاو مـەلای بـاوکـی (زەنـد)
لـێـك دووریـمـان بـۆتـە چـەنـد
هـەسـتـە وەرە گـیـرمـەبـە
بـەبـێ چـراو چـوونو چـەنـد
وەرە بچـیـنـە سـەر بـەحـر
بـڕۆیـن هـەتـاکـو دەربـەنـد
کـتـریو نـانو چـای بـەریـن
ئـیـسـتـیـکـان، چـادانو قـەنـد
بـیـکـەیـنـە بـەزمو خـۆشـی
لـەسـەر گـۆمـی شـیـنو مـەنـد
لـە کـەنـجـارە دا تـەنـیـام
بـێ خـزمو دۆسـتو پـەیـوەنـد
لـەو دۆڵـەدا هـەر تـۆم هـەی
دۆسـتـی بـە ڕاسـتـیو یـەك دەنـد
خـەڵـکـی ئـێـرەش خـراپ نـیـن
خـاوەن تـوتـنو دەوڵـەمـەنـد
ئـەو دەشـتـی پـانو بـەریـن
قشـلاخـە مـێـرگـەو زەمـەنـد
بـۆ خـاوەن مـاڵو مـالات
خـۆشـە وەکـو (گـەدە) و (لـەنـد)
پـایـزو بـەهـاران خـۆشـە
بـۆ خـێـڵـەکـیو بـۆ ڕەوەنـد

بەخسوس بۆ ڕاوەماسی
بە قولاب بۆی بچییە سەر کەند
چبکەم لە (دۆڵە بەفرە)
ئاویش لەوێ نابێ بەند
پوورزای مەلاژنە (ئایشێ)
کەڵ بە موویەك دەکەن بەند
دۆستی وا پەیدا دەکەن
نەخورێ لەگەڵ پووتێ قەند
بەلام (کویخات) زۆر مەردە
زۆر زانو سۆدرەو سەهەند
(مەلا ڕەحمانی) چیکرد؟
خانووی (حەسەن)ی هەلکەند؟
(عەلی شکاکی) ژن برات
هەقی سەلاجەکەی سەند؟
بۆ شەو میوانی ئێمەی
میوانێکی مەردو ڕەند
چاوەڕێتە (فاتیحی)
بۆ قسەی خۆشی وەکو پەند

**کەنجاڕێ ١٩٨٣/٩/٢٤**

---

**مەلا ڕەسووڵی نەوزادی لە دایکبووی ساڵی ١٩٣٦ و لە ساڵی ٢٠٠٦ لە شارەدێی میراوەی سەردەشت کۆچی دوایی کردووە. یەکێك لە هاورێ نزیکەکانی شاعیربووەو زۆربەی دەورانی ژیانیان بەیەکەوە بوون.**

# دەردی پیری

نــازانــم چــۆنــم پــیــری گــەیــیــەســەر
چــۆنــی لــێــگــرتــم گــۆشــەو دەوروبــەر
پــیــرو زەعــیــفو ســەر لــێ شــێــواوم
لــوتــفــی تــۆم دەوێ خــودای بــانــی ســەر
بــەهــاری عــومــرم بــوو بــە پــایــزە ســاڵ
وەك بــەفــری زســتــان ڕیشــم هــاتــەدەر
کــۆخــەو نــالــیــنو هــاوارو ڕۆڕۆم
هــەر لــەبــەر پــیــری لــێــم کــەوتــوونــە دەر
بــەگــۆچــان نــەبــێ ڕۆیــنــم زەحــمــەتــە
لــەرزو بــێــهــێــزو بــێ لاقو لــەتــەر
بــەگــەنــجــی چــۆن بــووم شــۆخو قــیــتو قــۆز
بــەفــیــز، بــە دەمــار، بــە تــانــەو تــەشــەر
خــۆشــیــی ژیــانــم لــێ بــۆتــە خــەون
چــاوم نــابــیــنــێ ڕوخــســاری دولــبــەر
شــێــرو پــڵــنــگو ئــەژدیــهــای کــێــوی
چ حــەددیــان هــەبــوو بــکــۆخــن، بــێــنــە دەر
کــوێســتــانــی لاویــم زەرد هــەڵــگــەڕاوە
لــێــم بــوونــە ئــەغــیــار نــازدارو ئــەســمــەر
شــریــتــی عــومــرم هــاتــۆتــە دوایــی
هــەربــیــنــا جــێــم هــێــشــت دنــیــای پــڕ کــەدەر
پــیــری دایــهــێــنــام وەك دارتــاشــی چــاك
تــەڕایــی نــەهــێــشــت لــە گــیــانو جــگــەر

پشت چەمانەوەم مایەی پیریمە
سیس‌و ژاکاوو بێ سەمع و بەسەر
چاو بەچاویلکەو دەست بە گۆچانم
نەمماوە مەیلی چوونی دەشت‌و دەر
هەنگاو شل بوون‌و بێ خوردو خەویم
تا دوێنێ لەوان هیچ نەبوو خەبەر
هەرچی کردوومە گشت بەدبەختییە
پەنام هەر ئەتۆی سەییدی سەروەر
ئێستاش دەمبینی نەخۆش‌و چڵمن
بێتاب‌و تاقەت پیرو قوڕبەسەر
نەفس‌و شەیتان‌و دنیاپەرستیم
لەسەر ڕێگەی ڕاست خستمیانە دەر
سەرپاکی ئەعزام وەك گۆشت کولاوە
خوایە زۆر شوکرم بەقەزاو قەدەر
خوایە بۆ خاتری ڕەسوولی ئەکرەم
لەداوی شەیتان بمانهێنە دەر
خوایە پێش پیری زۆر خۆشە مردن
پیری مردنە بۆ بەنی بەشەر
بۆ ڕێی سەعادەت هیدایەتم دەی
دوورم کەی لە ڕێی پڕخۆف‌و خەتەر
(ئاشوفتە) حاڵ‌و پەرت‌و پەرێشان
نەسووتێم بەگڕی ئاگری سەقەر

**١٩٩٣/٦/٢٢ گردئاشەوان**

# شینێك بۆ فڕووجەكانی

## كاك مەلا ( ڕەسووڵی ئەحمەدی )

**(ئەم پارچە شیعرە لەبەر ئەوەی بە ئەمری مامۆستا (نەجمەدینی کەوکەبی شاد) بۆ تازیەی فڕووجەکانی کاك مەلا (ڕەسولی ئەحمەدی) دانیشتووی گوندی (سەپێکان)ی مەنگوڕایەتی نووسراوە، بە یادگاری دەینووسمەوە.لەپێش فڕووجەکانیشی دوو بزنیشی خورابوون)**

شین و واوەیلا لە ماڵی كاك مەلا، كردی زهوور
مامە ڕێوی بۆتە دوژمن، لەو مەلای پڕ فەیزو نوور
بێ ئەوەی کەس پێ بزانێ، ڕێوی ئەحمەق هاتەپێش
شەش فڕووجی گرتو خواردن، بێ بەهانەو بێ قسوور
بوو بە چرپەو قیڕەقیڕ، ماڵی مەلا هەستان لە خەو
مام فەقێو ئاغاوو حاجی کردیانە لوورە لوور
كاك مەلا بەتوێی کراس ڕوویکردە پاش ماڵو گوتی:
من گوتم: پاش بزنەمس بۆچیمە گیسكو مورغو كوور
ئەی خودا ڕازیم بە ئەمرت ڕێوی باوام لێبکا
پیاو کە بێکەس بێ تەماشا، ڕێوی شەو لێی دێتە ژوور
شەش کەلاك ئەمڕۆكە هەرگیز سوحبەتی پێ ناكرێ
من چلۆن میوان بە ڕێکەم، هاتوون هەر شەش لە دوور
گەر بە نانو دۆ دەبن ڕازی، بەخێربێن سەر دوو چاو
چون فەڕی وان دای لە من، نەمما فڕووجی کەسكو سوور

ئـەو فـڕووجـانــە لـە بـۆ مـن وەك هـەزار سـەر مـەڕ دەبـوون
یـاڕەبـی ڕێـوی خـەجـالـەت بـی هـەتـاکـو نـەفـخـی سـوور
نـوێـژی سـوبـحـەیـنـان لـەخـەودا کـێ دەڵـێ هـەسـتـە مـەلا!!
بـۆچـی خـواردت ئـەو کـەلـەشـێـری جـوانو پـۆپـە سـوور
دەنگی هێند خۆش بوو بەیـانـی دەیـخـوێـنـد، بـولـبـول مـەسـەل
هــەر وەکـو داود کــە بــخــوێــنــێ لــە ئــایــاتــی زەبــوور
مـامـرە بـۆریـش هـەمـوو ڕۆژ خـاوەنـی یـەك هـێـلـکـە بـوو
باڵو پـەڕیـان پـاك شـکـانـدم، سوێـنـد بـە مـوسـای کـێـوی تـوور
چـاوی پـیـس بـوو وای لـەگـەڵ کـردم لـە بـزنو جـووجـەلـە
دڵ بـە هـیـچ خـۆش نـاکـرێ بـۆ چـیـمـە مـن قـەسـرو قسـوور
مـامـە حـاجـی بـەرخـێـکـی دەخـورێ، دەڵـێ مـالـم نـەمـا
بـزنـەمـس بـا هـەر لـەوێ بـێ چـۆڵ بـوو مـالـم خـوارو ژوور
(حـاجـی سـەیـد) سـەد قـەلـی نـێـری هـەیـە هـیـچ نـاخـورێـن
ڕۆژ نـیـیـە نـەخـورێ لـە مـالـم بـارەکـەی گـەردن بـلـوور
(فـاتـیـحـی) تـوخـوا بـنـووسـە بـاسـی بـزنو جـوجـەلان
چـون مـەڕی عـالـەم هـەزارەی کـردووە بـۆتـە کـلـوور

چەکۆ ١٩٩٦/٨/٦

# دەردە دڵ

پـایـیـزەو بـەفـر دایـپـۆشـی قـەنـدیـل
سـافو بـێـگـەردو سـپـی وەك مـەنـدیـل
دڕا کـــراسو کـــەوای فـــەقـــیـــران
بـن سـۆبـەو کـورسـی عـالـەم دەکـەن دیـل
زۆرکـەس لـە سـەرمـان چـلـمـی شـۆڕ دەبێ
ڕەش هـەلـدەگـەڕێ وەك زوغـالو قـیـل
پـیـاوی دەولـەمـەنـد ئـەورۆکـە دیـارە
ئـەو کـەسـەی هـەیـبێ نـەوت دوو بـەرمـیـل
چـەنـدەم پـێـگـوتـی داران پـەیـدا کـە
بـەقسـەت نـەکـردم شـێـتـی کـەلـلـە فـیـل
گـازۆڵو نـەوت و ئـازووقـەی زسـتـان
پێویستیی ژیانـن، کـوڕگـەل، قـەومو قـیـل
هـەر بـۆی دانـیـشـەو دووکـەڵ بـەبـا کـە
بـەلا لـەخـۆت داو سـیـغـارو سـەبـیـل
کوێسـتـان زسـتـانـان زۆر سـەخـتو تـووشـە
چـی لـەگـەڵ نـاکـرێ بـە ڕیشـوەو بـەرتـیـل
بـۆ (مـەلا قـادر ) و (خـدری بـاروزە)
وان لـە (مـیـراوەی مـامـۆسـتـا خـەلـیـل)
دڵـم زۆر گـەرمـەو لـەجـۆشـە بـۆیـان
تـا دەیـانـبـیـنـم (فـالـصـبر جـمـیـل)

ماشەڵڵا جوانە لارو لەنجەکەی
کە دێت ڕادەبرێ (سەیزادە نەشمیل)
زۆرم حەول دا نەبوو بە یارم
ئەو کیژە کوردەی نەجیبو سەقیل
لێی لە هەڵڵا دام کردیە قاوە قاو
ئەو غەزەب زۆرەی مەرحەمەت قەلیل
بن سۆبەم جێیە تا مانگێك بەهار
خوایە کارساز تۆی بنێری دەلیل
لە (گردئاشەوان) بێ دۆستوهاودەم
کەس وەخۆم ناگرێ بێ بەلگەو کەفیل
یاخوا دوژمنت بەر سەرما کەوێ
دوژمنی پیسی دۆس نەگری بەخیل
کرێوەو باکوت، شڵێوەو باران
یاخوا میوان بن لە پیاوی ڕەزیل
بەبێ ڕەشەبا خۆشە گەرمەسێر
لە گۆشتا سوورن بەرغەڵو بەردیل
بەتانەو تەشەر سەرکوێری کردم
زۆر بێوەفا بوو لەگەڵ من شەمیل
(ئاشوفتە)م ئەمرۆ بێ جێ و مەکانم
هاوار سەیدانی (تورجان و زەمبیل)
**١٩٩١/١٢/٢ گردئاشەوان**

---

دەردە دڵێك لەگەڵ مەلا قادری نێزەیی و مەلا خدری بارووزە.

# پیرو بێ تاب و تەوانم

مـن لـەدەس جـەوری زەمـانـەو غـەمـزەیـی دوو چـاوی کـاڵ
بـێ قـەرارو سـەبـرو ئـارامـم، نـەخـۆش‌و خـەسـتـە حـاڵ
بـاخـی سـیـنـەی ئـەو گـولـە تـەشـبـیـهـی نـاوێ، جـەنـنـەتـە
زەردو سـوورن وەك شـەمـامـە، سـێـوو لـیـمـۆو پـرتـەقـاڵ
عـەسـکـەری ڕۆم‌و فـەرەنـگـی دەسـتـەدەسـتـە خـسـتـەپـێـش
ئەو گولە خۆش مەنزەرەی شیرین قـەدەی پـڕ خـەتـتـوخـاڵ
هاتـە خـەنـدەو پـێـکـەنـیـن پشکوت گولـی سـەر لـێـوەکـەی
هـەر وەکـو قـەوس‌و قـوزەح بـەو نـازو عـیـشـوە هـاتـە مـاڵ
هەر وەکو نەی کونـکـونـە جـەرگـم بـە ئـەبـرۆی ئـەو بـوتـە
مـانـی، کـوا ئـاوا دەزانـێ ڕێـك بـخـا حـوسـن‌و جـەمـاڵ
بـولـبـولـی گـولـزاری عـیـشـقـم نـەغـمـەخـوانـی گـولـشـەنـم
شـێـت‌و دێـوانـەی پـەری ڕوخـسـارو کـولـم‌و لـێـوی ئـاڵ
ئـەی ڕەفـیـقـان مـن ئـەوا دەمـرم لـە دووریـی دلـبـەرم
کـۆچـی دلـدار وای لـە مـن کـرد کـەوتـووم بـێ زمـان‌و لاڵ
پـیـرو بـێ تـاب‌و تـەوانـم زولـفـی یـار گـۆچـانـمـە
یـادی بـۆسـەو پـێـکـەنـیـنـی جـەزبـی کـردم وەك مـنـاڵ
ئەمـڕۆ فـەرمـووی (فـاتـیـحـی) ڕاسـتـی دەزانـی پـێـت بـڵـێـم
وەسـڵـی مـن نـابـێ لـە بـۆ تـۆ، شـەربـەتـە شـیـریـن‌و تـاڵ

**چەکۆ ١٩٩٦/٦/٢٨**

# دڵ

مەحرەمی ئەسراری غەیبو مەعدەنی ئیمانە دڵ
بەخشش‌و فەیزی خودایە گەوهەری پەنهانە دڵ
عاریفی فانی دەزانێ چۆنە عیشقی مەعنەوی
بۆ مریدانی تەریقەت، دەشتی بێ پایانە دڵ
هەر کەسێ عیشقی لە دڵ دابێت‌و سەودای حەق ببێ
ئەو دەزانێ چۆنە سووتان، نالەوو حەیرانە دڵ
بێ خەبەر ئەو شەخسەیە ئاگای لە سۆزی دڵ نەبێ
عاشقی شێوەی خودا ناسان‌و پیاوچاکانە دڵ
ئەی خودایە پێم کەرەمکە سینەیێکی پڕ لە سۆز
فەرزە بۆ من شادو مەسرووربم کە وەك سولتانە دڵ
گەرچی مەحزوون‌و فگارو سەرکزو دێوانەمە
خۆش بەحالم جێ‌و مەقامی وا لە لای شانانە دڵ
دڵ ئەگەر مەحبووبەکەی غافڵ نەکا هیچ کات‌و سات
خۆشەویستی حەق تەعالاو سەروەری مەردانە دڵ
زیکرو فیکری حەق لە هەر دڵ جێگرو ئامادە بێ
لای خودا دۆستان بەچەشنی ڕۆژی ڕوون تابانە دڵ
خادمی دەرکەی ئەوانەم بوونە پەروانەی چرا
کاروپیشەی ڕۆژو شەو خۆکوشتن‌و سووتانە دڵ
مەستی بادەی خۆشەویستی کێیە؟ یاری من نەبێ
سۆزو گریەی زۆر بە تاوە لەو دەرو هەیوانە دڵ

مــن ســەگــی ئــەســحــابــی یــارانــی ڕەســوولــی ئــەکــرەمــم
خــاکــی بــەرپــێــی ئــەولــیــاو تــۆزی دەری خــاســانــە دڵ
خوایە خۆت فـەرمـووتـە یـاری دۆسـتـی مـن، دۆسـتـی مـنـە
شێتو ماخولیای تـەریـقـەو سـیـلـسـیـلـەی (سـەلـمـانـە) دڵ
خۆشەویستـیـی ئـالـی (عـوسـمـان) و (عـەلـی) فـەڕزە لـەلام
بۆ (ئەبوبەکر) و (عومەر) وەك حـەسـحـەس و دەربـانـە دڵ
(فاتـیـحی) عـومـری بـە ئـاخـیـر گـەیـوە کـاتـی ڕەحـمـەتـە
بــێ پــەنــاو بــێــچــارە مــاوە لــەو دەرو دیــوانــە دڵ

**گردئاشەوان ٢٠٠٢/٩/١٠**

## چوومە سەیری باخ و گوڵشەن

چوومە سەیری باخو گولشەن دیم گولێکی نەونەمام
سەبرو ئارامی نەهێشتم ژینی لێکردم حەرام
بۆنی عەترو مێخەکو سملی فەزای داگرتوە
مەستی بادەی عیشقی یارم، دولبەری شیرین کەلام
نالەنالو شیوەنم، دنیای هەموو گرتۆتە بەر
زۆر بە مەحزوونی لە حوجرەم، دێتە گوێ دەنگو سەدام
هات بەلارو لەنجە وەك بازو شەهێن جەرگی بڕیم
بۆ عیلاجی دەردەداریم، شەو بە تەنیا هاتەلام
چووم وتم وەك جاری جاران، نیمە بیرو هەستو هۆش
وەك تەبیبی دەردەداران، بێرەلام هەر سوبحو شام
زولفی ڕامالی لەسەر ڕووی، ڕۆژی ڕووناك کەوتە دەر
چونکە بۆخۆی چاك دەزانێ چەشنی پەروانەی چرام
هەر وەکو هارووتو مارووت، توونیی[1] دیداری گولم
خوایە شوکرم زۆر دەمێکە دوورە یارو بێ سەلام
بێری کوێستانی گەدەو لەند، شۆخو شەنگی نازەنین
تووشی خۆشی هەر نەهاتووم، لەو دەمەی لێت هەڵبڕام
خوایە غەفارولزنوبی بۆ موتیعو بۆ شەقی
بمخەرە زومرەی عەزیزان، ڕۆژو شەو دەستەو دوعام
هێندە زۆرە نیعمەتو لوتفت، خوداوەندی کەریم
من گونەهبارو خەجالەت چاوەڕێی جوودو عەتام
کێ دەفریای کێ دێ غەیری زاتی پاکی بێ شەریك
ئەی خودا ڕوحمێ بەحالی (فاتیحی) هەرزەو نەفام

**٢٠٠١/٨/٢٤ گردئاشەوان**

---

(١) تووني: تينوو.

# به تانەو تەشەر

بەتانەوتەشەر سەرکوێری کردم
بە پرتەو بۆڵەی بێ خێری کردم
زۆر مەمنوونم بوو تا بوو بە دۆستم
تووشی ڕێی سەختو هەڵدێری کردم
بە ڕیابازی و بە زمان لووسی
بە درۆو دەلەسان تێر تێری کردم
لە شەڕگەو قەندیل وەك بازو کەو بووم
ئاوارەی (قەراج) هەولێری کردم
بەکەشمو نەشمو بە لارو لەنجەی
چەتەو دز نەبووم ئەو فێری کردم
لە خۆشەویستیی دۆستان بێبەشم
لە (نازە) و (فامە) و لە (مێر) ی کردم
بەرخۆڵەو کۆرپەی باوەشی یار بووم
بەقسەی بەدکاران هاوێری کردم
پەروەردەی میهرو نەوازشی بووم
بە غەمزەی چاوان، شەل، گێڕی کردم
فەلەك نازانم ئەرێ لەسەرچی
بێ سووچو تاوان وا هێڕی کردم
(فاتیحی) وەختێك گەوهەر فرۆش بوو
بێ ماڵو سامان، بێ زێڕی کردم

**٢٠٠٠/٨/٣٠ گردئاشەوان**

# دەچم

گەر ئەجەل لێم بگەڕێ بۆو کەژو کێوانە دەچم
بۆو چیا سەرکەش‌و زەنوێرو گولستانە دەچم
هەر بەهار بێتەوە بەفری دەرو دەشت بێتەوە ئاو
بۆ سەری لەندو سەهەند عاشق‌و مەستانە دەچم
چیدی خەم ناکەمە بارو، بە هەوای عیشقی گوڵان
بولبول ئاسا سەحەریی بۆو گوڵ‌و باخانە دەچم
مەستی دووچاوی حەبیبم دلەکەم ناسرەوێ بۆم
هەر دەبێ بچمە سەفەر ،(چلچەمە)، زۆزانە دەچم
سەد شوکر ئەمڕۆکە گوڵ سازە لەبۆ سەیرو گەڕان
موددەعی شوێنە ونە بۆو دەرو هەیوانە دەچم
گوڵ‌و گولزارە دەرو دەشتی وڵات، سەوزە زەمین
بۆ هەواخۆری بەرەو (شەڕگە) و و (قەیوانە) دەچم
جەننەتی سەر زەوییە خاك و وڵاتی سەردەشت
دلکەم وازی لە سەیرانگەیی (بێوران) ە دەچم
شەنگەبێری و کچی نازدارو نەجیب دێن‌و دەڕۆن
(ڕۆستەم ئالیان) ە هەوارگەی دلە (کەیوان) ە دەچم
(فاتیحی) چیدی وەدووی نەفس‌و هەوای دڵ مەکەوە
(مستەفا)، دۆستی قەدیم، چونکە لە (زووران) ە دەچم

**۲۰۰۲/۹/۱۵ گردئاشەوان**

# شینگێڕی

براگیان کۆچەکەت زوو کرد، دەزانی چەند پەرێشانم؟
بەگیانی تۆ قەسەم دایم لە تاوت چاو بەگریانم
قەرارمان وا نەبوو، وا زوو بەجێم بێلی بە تەنیایی
ئەدی بێ تۆ ئەمن چیبکەم گەلێ شێواوو حەیرانم
خوداپارێزەرت بێ گەرچی پێت نەگوتم خوداحافیز
بڕۆ جێگەت بەهەشت بێ ئەی جگەرگۆشەی دڵو گیانم
بە کۆلێك داخەوە جێت هێشتمو بێدەنگو باس ڕۆیی
ئەتۆ دەتگوت لەگەڵ تۆ ناشکێنم عەهدو پەیمانم
شەوم لێ بۆتە ڕۆژ نانووم برام، ڕۆژم شەوی تارە
وەها پەرتو پەرێشانم نییە ساتێك هەدادانم
لەناکاو هەربینا کاتی ئەجەل هاتو، منیش هاتم
مەلێ ئەو شێتی دنیایەو بەتەنیا من لە قەبرانم
لەناو ئەو گۆڕە تەنگە یاوەری تۆبێ خودای مەننان
لە بۆ تۆ دایمە هەردەم بەزیکرو دەس بە قورئانم
ئەتۆ ڕۆڵەت لە باوەشگرتو ڕۆڵەش شەوچرای تۆیە
منیش وا بارگەکەم تێکناوە دێمو وەختی نازانم
کە (خدری سۆفیانم) دی دلم جۆشی وەکو مەنجەڵ
براکەم چاوەکەم بۆ تۆ دەگێڕم شینو ئەفغانم

ئـەتـۆ خـۆ بـولـبـولـێـك بـووی کـاتـی لاویـت لـەو دەرو دەشـتـە
ئـەوێـسـتـاش بـێ سـەداو دەنـگـی غـەزەلـخـوانـی گـولـسـتـانـم
کـوڕو خـزمو بـرازاو کـچ، بـرا پـاك بـوونـە شـیـنـگـێـڕت
نـەلـێـی کـەس یـادی مـن نـاکـا لـە قـەومو قـیـلو خـزمـانـم
ئـەوەی ئـەمـڕۆ لـەدەس مـن بـێ قسوورنـاکـەم لـە هـیـچ لایـەك
حـەقـی خـۆمـە دەبـێ بـیـکـەم وەزیـفـەو ئـەرکـی سـەرشـانـم
بەجێت هێشت (فاتیحی)ی برات و، بەتەنیا چوویە خەلوەتگات
مـنـیـش ئـامـادەو و سـازم بـەجـێ بـێـڵـم ڕەفـیـقـانـم

**١٩٩٧/٩/٢٧ گردئاشەوان**

ئەم شینگێڕیە بۆ مستەفای برایەتی.

# دۆستی بەڕاستی

دەردی پـــیـــریـــم لـــێ مـــیـــوانـــە، لایـــەلایـــەی بـــۆ دەکـــەم
نـاسـرەوێ هـیـچ کـاتو سـاتـێ، هـەر هـەرایـەی بـۆ دەکـەم
ڕۆژو شـەو خـەو نـاچـتـە چـاوم، وەك مـنـالـی شـیـرەخـۆر
وەك گـەزەکچـیو پـاسـەوان، قـیـڕەو هـەرایـەی بـۆ دەکـەم
پـەلـپو بـیـانـووی گـرتـووە سـەیـرانـی گـولـزاری دەوێ
بـەو سـەرو ڕیشـی سـپـی، ئـێـسـتـا سـەمـایـەی بـۆ دەکـەم
لێم گەڕێ بۆ خۆم ڕەحەت بم یەك هەناسە بەرمە سەر
دەچمە نوێژگە، دەس بە دەسنوێژ، هەر دوعایەی بۆ دەکەم
ڕام نـەکـێـشـێ بـۆ خـەرابـات شـوێـنـی لاتو سـەرسـەری
ڕوو بـە قـیـبـلـە ڕۆژی جـومـعـان، هـەر سـەلایـەی بـۆ دەکـەم
بـەو هـەمـوو جـەورو جـەفـایـەی بـۆ مـنـی هـێـنـایـەپـێـش
غـیـرەتـم لـێـم نـاگـەڕێ، داوای بـەقـایـەی بـۆ دەکـەم
داوی وای بـۆ نـاومـەوە مـاڵو سـەرم تـێـدا بچـێ
لـەو هـەمـوو تـاوانـە زۆرەی، هـەر حـەشـایـەی بـۆ دەکـەم
بـەو چـلـەی گـەرمـای تـەمـووزەو دەشـتـی وا گـەرمو بـەتـین
دەیـبـەمـە قـەنـدیـلو شـەڕگـە، کـەپـرو سـایـەی بـۆ دەکـەم
(فـاتـیـحـی)! دۆسـتـی بـەڕاسـتـی زۆر کـەمـە لـەو عـەسـرەدا
گـەر هـەبـێ دۆسـتـی بـەڕاسـتـی، شـەرتـە شـایـەی بـۆ دەکـەم

٢٠٠٢/٧/٩ گردئاشەوان

# پەرێشانی

پــەرێشــانو گــرفــتــاری دەســی چــەپــگــەردی گــەردوونــم
یەخەم بەرداو بـەرەڵلام کا، بـە ڕاسـتـی زۆری مـەمـنـوونـم
بــەداوی کــەیــدو مــەکــرو فــێــلــی دەوران، وا گــرفــتــارم
ئـەلـەم دنـیـا بـەریـنو پـانـەدا مـەمـنـوونـی هـەر دوونـم
بـەشـەو فـیـکـرو خـەیـالـم دەم فـڕێـنـێو دەبـمـە پـاشـایـەك
بەڕۆژ گەر خۆم دەبینم شێتو پـەتـیـارێـكو مـەجـنـوونـم
لـە کـونـجـی بـێـکـەسـیـدا بـوومـە یـەك غـوولـی بـیـابـانـی
لـە بـەر بـێ هـاودەمـی دایـم لـە گـریـان دامو مـەحـزوونـم
سەحەرخیزیی ئەگەرچی پـیـشـەیـی پـیـاوی خـودا دۆسـتـە
نەفس لێم ناگـەڕێ چـیـبـکـەم لـە کـاری چاکـە مـەزنـوونـم
بــەرەو پــیــری دەڕۆمو وەرزی لاویــم لــێ بــەجــێــمــاوە
سـەراسـیـمـەو پـەشـێـوحـاڵ، لائـوبـالـیو شـێـتـی هـامـوونـم
لـە داخو حـەسـرەتـی یـاری جـەفـاپـیـشـەو سـتـەمـکـارم
منیش وەك (فاتیحی)، (گردئاشەوان)ە گونـدی مـەسـکـوونـم

**٢٠٠٠/٧/٢٥ گردئاشەوان**

# حەسەن

(حەسەن) من عاشقی زولفو پەچەی داوداوو چین چینم
بریندارى خەدەنگی دوو برۆی (نەشمیل) و (نەرمینم)
بەهای ماچێکی یار ئەر رووحی شیرین بێ دەبەخشم پێی
هەلاتن زەحمەتە بۆ من، گرانو سەختو سەنگینم
ئەمن دۆستێکی وام لا خۆشەویستە دۆستی گیانی بێ
ئەگەر تۆ وەك (مەمی زینی) منیش وەك کاکە (بەنگینم)
ئەگەر تۆ مونشی مامۆستاو ئەمینداری هەموو خەلکی
ئەدی بۆ دیوەخانەو کۆشكو سفرەو خوانێ نابینم
سەبر پیشەی خودادۆستە، بەری شیرینە هەنگوینە
لەبەر بێ سەبری ڕۆژ و شەو، دەڕێژم ئەشکی خوێنینم
قەناعەت سەروەتو سامانی بێ پایانی ئینسانە
تەماعم سێ بەسێ لانا، قەناعەت بۆتە پەرژینم
نەخۆشیم پیرییە چیبکەم، نییە دەرمانێ بۆ دەردم
بەرەو مردن دەبێ سازبم، بە دوکتۆر نایە تەسکینم
دەوای زامی دلم نایەت، نییە لوقمانێ بۆ پیریم
کزو بێهێزو لەرزۆکم هەمیشە چاو بە ئەسرینم
زەمینو مەرتەعو کێلگەم، بیابانی خەیالاتە
لەوەش زیاتر شکی نابەم، لە دنیای تاڵو شیرینم
بەقووتی لایەموت غەیری مەلا کێ ژی لە دنیادا؟
ئەوە بەهرەو بەشی خۆنە، بە ویژدانو بە ئایینم

شوکر بۆخوا ئەتۆ وەك شای لە گەنمو نۆك، چەوەندەر، جۆ
تەماشای حالی من ناکەی کە چۆن شیواوە ڕێی ژینم
براگیان ئاخیری عومرەو، لە دنیاش کەس ئەبەد نابێ
مەگەر نابینی چۆن غەرقی فوغانو شیوەنو شینم
نەخۆشی وەك برای خوێنگر، شەوو ڕۆژ هەر لەگەڵمایە
بە هیچ نەوعێ بەرم نادا هەتا نەخوێنرێ یاسینم
عیلاجی کەس بەکەس نایە، خودا کارسازە بۆ کاران
وەکو یادگار هەڵی بگرە (حەسەن) دەسخەتتو نووسینم
کە بارگەی تێك وەپێچا (فاتیحی) بۆ مەنزلی دوایی
لەگەڵ (سمایل) بەجووتە زوو وەرن بۆ کفنو تەلقینم

**١٩٩٨/٣/٣ گردئاشەوان**

---

**ئەم نامەیە بۆ کاك ( حەسەن بێشیری ) خەڵکی گوندی ( لاوێن ) ی سەر بە دەڤەری پیرانشار نووسراوە. کە هاوڕێیەکی شاعیر بووە.**

**- سماییل : مەبەست مامۆستا مەلا ئیسماعیلی نەبی پوریانە. کە ئەوکات مەلای گوندی ( لاوێن ) بوو.**

# ئەلا ئەی نەفس

ئەلا ئەی نەفسی بێ ئاگا لە مردن
هەتاکەی غەفلەتیو خۆماندوو کردن
وەها غەرقی لە زەلکاوی نەزانی
وەکو حەیوانە پیشەت خوردو خەوتن
وەکو گورگی چیایە کاروپیشەت
دڕینو سەربڕینو لاشە خواردن
ئەوەندە پیسو بەدئەخلاقو پەستی
براو دۆستت لەخۆت کردوونە دوژمن
شەوو ڕۆژ وێڵو سەرگەردانی تاکەی؟
لەگەڵ شەیتان ڕەفیقی، پیسی ورگن
گڕی ئاگر دەسووتێنێ وجودت
جەزای ئەعمالی خۆت دەتکا سەرەوبن
لەناو ئەو گۆڕە پڕ دووپشكو مارە
براو خزمو کەست بۆت نابنە زامن
بەگورزی ئاگرینی دەس زەبانی
هەموو ئەعزات دەسووتێ چەشنی ئاسن
هەتا فرسەت هەیەو ڕێی تۆبە ماوە
لە نوێژگە دابنیشەو بگرە قوژبن
بەکارنایە ژنو ئەولادو ماڵت
پەشیمان بە لە کردەی چەوتی شەرمن

بــلــێ خــوایــه بــبــووره لــێــم کــهســاســم
ســهقــیــلو دڵ ڕەشو ئــهمــمــاره کــوشــتــن
پــهنــادەگــرم بــه تــۆ خــوایــه لــه شــهیــتــان
لــه هــهر کــارێــکــی نــاشــهرعــیو چــهپــهڵ، مــن
خــودا غــهفــفــارو ســهتــتــارولــعــیــوبــه
دەبــا یــاغــیــگــهریو بــێ دیــنــی بــهس بــن
گــونــاهــت هــێــنــده زۆرەو قــورســه بــارت
کــوڕو کــچ دوژمــنــن ســهبــبــارەیــه ژن
بــبــهخشــه ئــهی خــودا تــهقســیــرو عــوزرم
لــهکــاتــی گــۆڕەکــهم دەکــرێ بــهســهنــگــچــن
پــهنــا بــۆ عــاصــیــان هــهر تــۆی خــودایــه
دەوایــهك بــۆو دڵــهی بــرژاوو کــونــکــون
بــهپــیــریــیــش ڕوو لــه تــۆم بــۆ تــۆ پــهرســتــی
خــودایــه ڕێــی نــهجــاتــم لــێ نــهکــهی ون
بــهچــاوی پــڕ لــه فــرمــێــسكو دڵــی تــهنــگ
بــهڕیشــی بــۆزو ســیــنــهی ئــهنــجــن ئــهنــجــن
لــه دەرگــات کــهوتــووم ڕووزەردو بــێــهــێــز
چــهوێــڵ و نــالــهبــارو چــهوتو قــرژن
خــودایــه پــادشــای جــیــنــنو بــهشــهر تــۆی
ئــیــتــر هــهر ڕوو لــه تــۆم بــۆ تــۆ پــهرســتــن
وەره ئــهی (فــاتــیــحــی) تــا مــاوه ژیــنــت
ڕەفــیــقــی چــاکــهکــارانــبــه وەکــو مــن
**گردئاشەوان ١٩٩٧/١٠/١٤**

# لایقی زنجیرو کۆت

بـێـی بـەفـریـادم خـودایـە، پـیـرو بـێ چـارەم ئـەمـن
دەردەدارو چـاوکـزو مـەعـلـولـی ئـەو شـارەم ئـەمـن
دەی ڕوحمکە با نەجاتـم بێ لـە دەس نـەفسی خـەبـیس
گەر نەکەی چارەم بـەلـوتـفـت، شـێـتو پـەتـیـارەم ئـەمـن
چاوەڕوانیم زۆرە لێت، مـەحشـەر نـەبـیـنـم ئـێشو دەرد
ئەی خودا ڕوحمێ، ئـەسـیـری نـەفسی ئـەمـمـارەم ئـەمـن
خوایە خۆت فەرمووتە: بـەخشـەنـدەو غـەفورو سابـیـرم
زۆر گـونـاهـکـارو نـەزان، بـەدبـەخـتو بێ کـارەم ئـەمـن
(مـاشـربـت الـحـمـر فـط)، خـۆت دەزانـیو ئـاگـەهـی
خـاوەنـی قـەلـبـی شـکـاوو، جـەرگـی سـەدپـارەم ئـەمـن
زایـەلـەی زەنـگـی خـەتـابـاریـم لـەحـەد بـردۆتـە دەر
لایـەقـی زنـجـیـرو کـۆتو حـەبـسو سـێـدارەم ئـەمـن
یا ئیلاهی پـێـم عـەتـاکـەی، ڕەئـفـەتـی خـەیـرول بـەشـەر
مـەسـتو بـێـهـۆشـی شـەرابـی دەسـتـی ئـەو یـارەم ئـەمـن
(یـوم الـقـبـض الـوجـوه) سـەربـەرزو رووسـورم بـکـەی
فـێـڵـەبـازو حـیـلـەبـازو خـوارو مـەکـکـارەم ئـەمـن
یا ئـیـلاهـی تـۆ بـە جـاهـی قـیـبـلـەگـای جـیـنو بـەشـەر
(فاتیحی) م ڕوحـمـێـك بـە ئـاهـم، زۆر سـیـاچـارەم ئـەمـن

**١٩٩٨/٥/٨ گردئاشەوان**

# پیری

لەپیریمە کە چاوم ڕوو لە سستین
کزیی چاو هۆیەکەی بێ دینییە، دین
چرای دین گەر لە دڵ کوژاوە قوربان
دەوای نادا مەگەر گریانو نالین
دەواو دەرمانو دوکتۆرو تەداوی
وەرە با پێت بڵێم بۆ چاری تۆ چین
کەڕو لاڵ بەو، لە مزگەوت گۆشەگیربە
ئەوە دەستووری قورئانو شەهی دین
براکەم چاوەکەم ڕۆڵەم کوڕی ژیر
شیفای سینەی بەسۆزو چاوی بەگرین
لە ڕێی ڕاست لانەدەی بەقسەی ئەمو ئەو
قەلای مەردانە دین، پەرژینە پەرژین
غولامی ئەو کوڕەم ڕێی چاکە دەگرێ
لە تاریکیی شەوا دەڕژێنێ ئەسرین
نەزان بووم کاتی لاویم، خۆ ئەوێستاش
هەزار حەیفو ئەسەف بۆ کاتی لاوین
نە گۆشەی خانەقایەو کونجی مزگەوت
بەڕەڵلاو سەرسەری بێ هێزو بێ تین
بە شینو دادو ڕۆڕۆ ناکرێ چارت
زەلیلو بەدبەخت بارقورس و سەنگین

شــەوو ڕۆژ بـانـگ دەکـا لـێـت پـەیـکـی مــردن
هـەتـا دێـم سـاز بـکـە پـێـش بـاری تـەلـقـیـن
لـە نـاکـاو دێـتـە ڕێـت بـێ مـۆڵـەتو دەنـگ
دەفــریــات نــاکــەون گــریــانو یــاســیــن
هــەتــا مــاوی لــە دنــیــا چــاکــە دۆســت بــە
بـەتـالـە (فـاتـیـحـی) ژیـن بـێ سـەخـاو دیـن

**٢٦/٩/١٩٩٧ گردئاشەوان**

# گوڵی دڵ

گـوڵـی دڵ بــە، مــەبــە دڕکــی مــەمو زیــن
فڕێدراوی کـە تـاڵ بـی، خـۆبـکـە هـەنـگـویـن
لـەلای دۆسـتو نـەیـار زۆر خـۆشـەویـسـتـە
کەسێك هەیبـێ حـەیـاو ویـژدانو تـەمـکـیـن
وەها مەشـهـوورو مـەعـلـومـە لـە لای خـەڵـك
خـودا خـۆشـی دەوێ ئـیـنـسـانـی سـەنـگـیـن
بـە فـەرمـوودەی خـوداو سـەرداری ئـێـمـە
بەهەشـت جـێـیـە لـە بـۆ دیـنـداری مسـکـیـن
گــەر پـــیــاوی خــودایو خــۆنــەویـســتــی
لـە کـاتـی نـیـوەشـەو بـڕژێـنـە ئـەسـریـن
دەخـیـلـت بـم نـەدەن عـومـرت بـەزایـە
وەکـو مـن خـۆت نـەخـەیـتـە ئـاگـری قـیـن
قســەی زارو دلــت مــەزڕێــنــەلای کــەس
لـە دەورەی گـوڵ دەبـێ قـایـم بـێ پـەرژیـن
وجــوودی نــاســكو نــەرمو لــەتــیــفــت
دەبـێـتــە خـاكوخـۆڵو کـرمـی قـەبـریـن
هـەلـەو هـەلـکـەوتـووە تـا مـاوە عـومـرت
بـکـە وێـردت شـەوان (تـاهـا) وو (یـاسـیـن)
بـەجـێـی دێـلـی ئـەوەی لات خـۆشـەویسـتـە
کوڕو ژن، مـالـی دانـراو چـیـن لـەسـەر چـیـن

لـە دایـك بـووی بـە بـێ پـۆشـاك و، عـوریـان
وەهاش دەمری بـە ڕووتـی مـاتو غـەمـگـیـن
دەزانــم زگ پــەرسـتــی، تــێــر نــەخــۆری
حـەرامـت پـێ حـەلاڵ بـێ، نـەقسـە بـۆ دیـن
لە خەو هەستە بە غـەفـڵـەت ڕۆیـی عـومـرت
خـەوو خـواردن نـیـشـانـەی پـیـاوی عـاصـین
دەبـێ ئـەمـڕۆ بـکـەی فـیـکـرێـك لـە حـالـت
هـەتـا تـێـت دا هـەیـە هـێـزو گـوڕو تـیـن
هـەتـا لاوو بـە کـەلـکـی، کـەلـکـی خـۆت بـێ
ئەگەر پیربووی نەخۆت هیـچـیو نـە نـالـیـن
خـودایــە مـوو سـپـیـم و پـیـرو بـێـهـێـز
بە مـن بـا خـۆش نـەبـێ شـەیـتـانـی بـێ دیـن
ئــەوا دوا ڕۆژی عــومــرەو کــاتــی مــەرگــە
وەرە ئەی (فاتـیـحی) بـا تـێـر بـکـەیـن شـیـن

**١٩٩٨/٥/١٧ گردئاشەوان**

# بۆ مەلا قادری نێزەیی

قادرا ئەی خۆشەویستی (سوێسنی) و (مەنگوڕ) و(نەلێن)
قادرا ئەی شێری شەرزەی، شاخی (نێزە)ی خەمڕەوێن
قادرا ئەی شۆڕە لاوی، بێ فڕو فێڵو نەجیب
قادرا ئەی حاکمی گەل، بۆ هەژاران تۆلەسێن
قادرا ئەی خانو لانە، بۆ غەریبو بێکەسان
قادرا ئەی حاتەمی تەی، خاوەنی شەرتو بەلێن
ئەی کوڕی ڕۆژانی سەختیی، مەعدەنی سیدقو سەفا
ئەی ڕەشوبرشی بەغیرەت، بۆ شەڕو بۆ شەپێن
بۆچی لێم لا لووتی بەینێکە، بە قەلست تێدەگەم
گیان فیدای تۆمە عەزیزم، دۆستی گیانیم پێ دەلێن
تۆ و (خلە) و (سەددیقی) دنیاتان بە گالتە بردە سەر
کاکی (زوودی) ش بۆتە شێخی (گولفەت) و (قەبری حسێن)
قادرا قشلاخە دەورەت، ڕۆژی چاکەو غیرەتە
جێن سیاکێوە عەجایەب، قاقڕێکەو بەردەلێن
ئێمە لێقەوماو و بێکەس تۆش غەنیو خاوەن کەرەم
ئێمە موحتاجی زەکاتین، تۆش هەتە گەنج و خەزێن
ڕۆژی تەنگانە ئەگەرچی کورتە مەودای، کاکی خۆم
زۆر کەسم دیون فەرق ناکەن، هەچی بێ هەر دەگێن
ژینی دونیا بۆیە خۆشە دۆستو ئەحباب بێنە لات
قالە گیان نامانەوێ قەت، هاودەمی جووتە وەشێن

پـیـری دەردێـکـی گـرانـەو، کـەنـدو کـۆسـپـیـش بـبـنـە بـار
کـاتـی لاویـمـان لـەدەس چـوو، چـاوەچـاو گـۆشـەو کـەلـێـن
سـەنـگـەری مـەردایـەتـی خـالـی نـەکـەی قـادر دەخـیـل؟
پـیـاوی ئـازا، نـاهـەقـە لـەو ڕۆژە تـالـەیـدا هـەلـێـن
بـوویـە کـابـرای گـونـدی (مـاسـتـێـنـان) بـۆ هـەر لایـەك دەچـی
(ناز) و (نـازدار) و (زولـەیـخـا) یـەو (کـەژاڵ) و (فـات) و (زێـن)
ڕۆژگـــار وا دێـــت و دەڕوا، چـــەوت و چـــێـــڕە کـــارەکـــەی
تـۆپـی فـوتـبـالـە یـەکـێـك و، یـەك بـە چـەشـنـی گـۆی شـەقـێـن
قـەولـی داوە بـێ لـەگـەڵ تـۆ، کـاکـە (عـوسـمـانـی وەجـاخ)
بـۆی دەچـیـنـە بـاخو سـەیـران، چـۆمـی (لاوێـن) ی خـوڕێـن
(ئـاوژەڕۆش) بـۆخـۆت دەزانـی چـەنـدە خـۆشـەو بـاسـەفـا
ئـاوی (مـەیـدان) و (گـەدە) و لای (لـەنـد)ە ساردو سـەر تـەزێـن
(فـاتـیـحـی)، قـادر ئـەگـەر خـۆی گـێـل نـەکـا چـاك تـێـدەگـا
جـاروبـار خـۆی مـات دەکـا، وەك پـیـرە گـورپـەی سـەر کـولـێـن

**٢٦/١٠/١٩٩٦ گردئاشەوان**

---

**مەلا قادری حەسەن پوور ناسراو بە( مەلا قادری نێزەیی ) لە دایکبووی ساڵی ١٩٢٦ و ساڵی ٢٠١٦ لە شارەدێی میراوەی سەر بە شارستانی سەردەشت کۆچی دوایی کردووە. یەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانی شاعیربووە.**

**خلە : مەبەست مامۆستا مەلاخدری باروزەیە، ( سدیقی ) ش مەبەست مامۆستا محەممەدی سدیقی سەعاتسازە. کە هەر دووکیان خەلکی گوندی میراوە بوون.**

**کاکی زوودی: مەبەست مامۆستا مەلا محەممەدی زوودییە.**

**گوڵفەت و قەبری حسێن، دووگوندی سەر بە شارستانی پیرانشارن.**

# ئەو سیاچاڵە

بەچەشنی بولبولی شەیدا، شەوو ڕۆژ هەر دەکەم نالە
خودایە قانیعو شوکرم، لەسەر ئەو وەزعو ئەحوالە
شەوی دەیجووری دووری تۆ، وەکو بورکانە بۆ گیانم
ئەگەر مەیلت نەبێ قوربان، فیراقت تالە وەك ژالە
لە دووریت مەستو حەیرانم، شەوو ڕۆژ هەر غەزەلخوانم
کە شادی بێ بەمیوانم، شەوم زۆر خۆشە وەك سالە
موریدی پیری مەیخانەم، ئەگەر ساقی ئەجەل بێڵێ
شەرابی هیجری دلداران، بەژانە زەحمەتەو تالە
ئەوەی دلداری لەیلایە، لە بەزمی عاشقان مەستە
دەبێ مەستی خەرابات بێ، ئەوەی ناپوختە مندالە
بەرام سەیرێکی دنیاکە، وەها شێواوە بازاڕی
ئەوەی عەقڵی هەبێ شێتە، ئەوەی بێ عەقڵە بەدحالە
وەکو بەردی ڕەشی حاجی، تەوافی گەر نەکەم نابێ
مەتافی عامە ئەو بەردە، نەزەرگەی خاسە ئەو خاڵە
لەگەڵ ئەم نەفسی ئەممارە، بەدایم هەر لە شەڕدامە
ئەبەد چارەی بەکەس نایە، ئەوە شەیتانە وا زاڵە
عەتاو بەخشین لە تۆ جوانە، لە هەر کاتو سەعاتێکا
لەکاتی مردنا فریام کەوە، زۆر سەختە ئەو حاڵە
خودایا خۆت کەریم (غافرالذنب)ی گوناهانی
ببەخشە (فاتیحی)، بیکە بە جەنتەت ئەو سیاچاڵە
٢٠٠٢/٦/٢٨ گردئاشەوان

# گوندی بێوران

خـودایــە کــاروبــارت چــەنــد شــریــنــە
لــە لایــەك شــادیــە لای دیــکــە شــیــنــە
ولاتــێــك دێــمــەکــارەو قــاقــڕو بــێ ئــاو
ولاتــێــك جــۆ و جــۆبــارەو زەمــیــنــە
لـە لایـەك شـاری سـەردەشـتـە بـەڕاسـتـی
لـە بـووك جـوانـتـر، لـە بـارەو نـازەنـیـنـە
کـە پـێت خـۆشـە بـبـیـنـی بـاخـی جـەنـنـەت
وەرە (بـێـوران) و (دووکـانـان) بـبـیـنـە
وەرە بـێـورانـی خـوارێ و بـێـورێ ژووروو
بـەهـەشـتـێـکـن لـەسـەر ڕووی ئـەم زەمـیـنـە
(قـەلات) و (کـانـیـە ڕەش) خـولـدی بـەریـنـن
بـۆ هـەر لایـەك دەچـی هـەر گـوڵ چـنـیـنـە
قـەدی کـیـژانـی وەك سـەروی خـەرامـان
بـە لارو لـەنـجـەیـان، عـاشـق حـەزیـنـە
پـەریـزادو هـەلالـەو نـازو نـازدار
پـەریو شـیـریـنو شـیـلانـەو هـەمـیـنـە
وەکـو کـەو ڕوو بـە خـاڵو شـۆخو شـەنـگـن
مـەجـەو فـاتـەو مـرەو شـەنـگێ و جـەمـیـنـە
لـە مـەڕدۆشـیـن کـە بـێـری دێـت و دەڕوا
وەکـو کـاروان کـوژەو مـانـگـی نـەویـنـە

لــەبــن بــاخچــەی هــەنــارو ســێــوو هــەرمــێ
هـــەرایـــەو بـــەزمو قـــاقـــاو پـــێـــکـــەنـــیـــنـــە
لـە (سـەرچـاوەی ڕەسـووشـێـت)، کـیـژو کـوڕگـەل
هـەمـووی مـەسـتـی کـۆکـاو بـادەی ئـەویـنـە
(ڕەبـەن) بـەرزە وەکـو قـەنـدیـلـی سـەرکـەش
(جـەمـالـدیـن) پـیـر نـیـیـە بـەگـوڕو بـەتـیـنـە
بـەرابـەر گـونـدی (بـاوێ) وەك بـەهـەشـتـە
پـڕی حـۆری‌و پـەری شـەمسـول جـەبـیـنـە
لـە داوێـنـی (ڕەبـەن) کـۆخـێـك دیـارە
دەڵـێـن (سـۆفـیـەمـزە) یـەو، پـیـرەو بـەدیـنـە
هـەزار ڕەحـمـەت لـە گـۆڕی پـیـاوی ئـاوا
نـموونـێـك بـوو لـە بـێـوران دا کـوڕیـنـە
وەرە سـەیـری سـەراوو حـەوزو کـانـی
حـەمـام مـانـەنـدە هـێـنـد گـەرمو بـەتـیـنـە
حـەسـارو حـەوشـی مـزگـەوتـی سـەراسـەر
وەکـو فـیـردەوسـی ئـەعـلاوو بـەریـنـە
ڕەزو بـاخ‌و قـەتـارەی سـەروو سـۆسـەن
دەڵـێـی بـالاو قـەدو زولـفـی (سـەکـیـنـە)
هـەوای وا سـاف‌و خـۆش‌و بـێ غـەلـوغـەش
ڕوح ئـەفـزایـە شـنـەی خـولـدی بـەریـنـە
ئـەتـۆ پـێـت وایـە قـەنـدیـل و گـەدەو لـەنـد
وەکـو بـێـوران هـەمـیـشـە سـەوزو شـیـنـە؟

بــراگــیــان دۆڵــی بــێــوران عــەیــنــی جــەنــنــەت
هــەمــووی قــەســرو قســووری ســوورو شــیــنــە
وەکــو بــووکــی تــەبــیــعــەت پشــتــی ســەردەشــت
گــەلــێ مــافــەوقــی شــامو ڕۆمو چــیــنــە
ئــەوەی دڵ ئــارەزوی کــاو چــاو بــکــا مــەســت
لــەوێ مــەوجــوودو ســازەو چــیــن بــە چــیــنــە
زەمــانــی (کــەوکــەبــی) و (ســەیــدی حــوســێــن)ی
(شــێــخــەولا) و (مــامــە شــێــخ) ئــەحــمــەد فــەقــیــنــە)
(خــلــە) و (خــوارە) و (عــەزیــز) و (حــاجــی قــوربــان)
(ڕەســوو ســێ ســەر) لــەســەر بــوو ئــەو بــەقــیــنــە
لــەبــەر وان گــونــدی بــێــوران وەك بــەهــەشــت بــوو
لــەدوای وان ئــەو زەمــانــەم مــاتــەمــیــنــە
لــە مــەدحــی بــێــوری خــوارێ، لاڵو لــەنــگــم
بــەشــی تــۆش (فــاتــیــحــی) دنــیــا گــەڕیــنــە

**١٣/٦/١٩٩٤ گردئاشەوان**

---

**سۆفیەمزە: کورتکراوەی سۆفی هەمزەیە.**

# هات هەر وەکو عیسا

ئـاوی بـەفـراوی بـنـەی قـەنـدیـلـە یـا شـەهـدی دەمـە
ئەو شەرابەی دوێنـێ وێـتـدامو بـەخـۆشـیـت خـواردمـەوە
شـەو هـەتـا کـاتـی بـەیـانـی مـەسـتـی بـادەی وەسـڵـی تـۆم
ڕۆژهەڵات ون بوو شـەوم، ئـەو یـارە خـۆی لـێ شـاردمـەوە
بارگەکەی تێـکـنـا بـەرەو کـوێـسـتـان دەچـێ بـۆ بـانـەمـەڕ
ئەو هەموو دەردو پەژارەی، سەرلـەنـوێ پـێ سـپـاردمـەوە
خەرمەنی عومـرم بـەبـای پـیـری، نـە دانـی مـاو نـە کـا ی
هات وەکو عیسا بـەسـەرمـا، عـومـرەکـەی بـۆ بـژاردمـەوە
سۆفی تەکیەو خـانـەقـای یـار بـووم هـەتـا هـێـزم هـەبـوو
حەپسی چینی زولفی کردم، خۆشـیـیـەکـانـی ژمـاردمـەوە
زولفەکەت شانە مـەکـە، بـێ شـانـە پـەخشـەو ڕێـکـوپـێـك
مـەمـکـە جـێ لـۆمـەی نـەیـارانـت، بـە ئـاهـی ساردمـەوە
زۆر لەمێژە چاوەڕوان بووی، (فاتیـحـی) دەیـگـوت کـە یـار
ئەو دڵـەی بـردوویـەتـی، پـێـم سـەیـرە وا بـۆی نـاردمـەوە

۱۹۹۸/٥/۲۸ **گردئاشەوان**

# گێژی داوی بەعسییان

کوردە پێم نالێی لەبەرچی ڕووتو بێ پێلاوی تۆ
وەك هەتیوی بێنەوا مایل بەگەرمای تاوی تۆ
ڕۆژو شەو ئارەق دەرێژیو بەرهەمی سالت کەمە
گێژی دەستی بەعسییانی بۆیە وا داماوی تۆ
دوژمنت کێیەو لەبەرچی بێبەشی لە ژیانی خۆش؟
وەك گولی بەرتاوی هاوین سیسوپەرتووکاوی تۆ
هەستە وەك مەردانی مەیدانو کوڕانی تۆلەسێن
ئەو کەلەپچەو کۆتو زنجیرەت فرێدە، پیاوی تۆ
ڕاپەڕە هەلمەت بەرە سەر دوژمنە خوێنخۆرەکەت
داخەکەم بۆ هێزو تینو هەلمەتی فەوتاوی تۆ
وەك کەوی گۆشەی قەفەس مەخوێنە دژ قەومو گەلت
دوژمنت تەفرو تووناکە هەر وەکو لافاوی تۆ
ماڵو داهاتی هەموو سووتاندی دوژمن چی نەکرد
ئێستەکەش خاوەن ولاتێکی تەواو سوتاوی تۆ
خاکی سەوزو سووری کوردستانەکەت وێرانەیە
گیان فیداکەن بۆ وەتەن با گەنجو پیرو لاوی تۆ
ئەی وەتەن داخی گرانم بوویە ژێر دەستەی نەیار
یەك نموونەی ئاشکرایە شارو دێی ڕووخاوی تۆ
خۆشیی تۆ مەشهووری ئافاقەو هەموو عالەم دەلێن
عەینی وەك ئاوی حەیاتەچەشمەیی بەفراوی تۆ

کوردە بۆخۆت چاك دەزانی بەعس و هاوکاری ئەون
بوونە مایەی شین و نالەو جەرگی هەڵقرچاوی تۆ
زێڕی ڕەش کانگای ولاتی کوردە تۆ لێی بێ بەشی
لەو بەهەشتە پڕ لە نازو نیعمەتە ڕانراوی تۆ
پێ پەتی ئێستا لەجێگەی تۆ هەموو خاوەن بەشن
بێ بەشیی بۆ تۆیە کوردە وێڵ و لێقەوماوی تۆ
هەندەکت بوونە قوڵە چۆماخی دەستەی ئەجنەبی
تاکو وابی، بێ حسابی گەندەڵ و بێ ناوی تۆ
ئەو دەمەی خۆشی دەبینم دوژمنت ئاوارە کەی
چیدی نەڕژێ ئاوی سوێری دیدەیی گریاوی تۆ
دوژمنت کوا تۆ بەخاوەن بەش دەزانێ گیانەکەم
بۆیە هەر ڕۆژەی بەجۆرێ دیل و دەس بەسراوی تۆ
ئەی برا ئاوارەییم زۆر دی بە وەسڵت شاد نەبووم
(فاتیحی) ڕێگەی خەباتت سەختە هێشتە خاوی تۆ

**١٩٩٨/٥/٢٤ گردئاشەوان**

# گلەیی

ئەو زەمانەش خۆشدەبێ وەك جاری جاران، خەم مەخۆ
شین دەبێ ئەو دەشتو کێوە وەك بەهاران، خەم مەخۆ
بەفری زستانێ کە دایپۆشیوە شاخو شیوو دۆڵ
کارگو ڕێواسو کوڕادە دێن بە باران، خەم مەخۆ
زۆر لە مێژە شانی گرتووی نەگبەتیو کوێرەوەری
هەربینا ڕووی کردە مالت، ماڵو سامان، خەم مەخۆ
هاودەمێك پەیدا دەبێ ڕۆژگاری خۆی پێ بەریەسەر
هاوینو پایز خەلاس بن بۆ زمستان، خەم مەخۆ
شەمشەمەکوێرە ئەوەند زۆرن ولاتیان گرتە بەر
ڕۆژی ڕووناك دێتە دەر یا ماهی تابان، خەم مەخۆ
نالەنالی بێ کەسیت وادیارە زۆر سەختەو گران
دێتەوە لات عاقیبەت سەروی خەرامان، خەم مەخۆ
وەك شریتە عومری ڕابردووم کە دێتە بەر نەزەر
ئاو لە چاوم دێتەخوار وەك دوڕڕو مەرجان، خەم مەخۆ
هێندی دەڕوانم هەوالێك نابینم گەر بێتە لام
شای شەکەرلێوان لە باخان دێت خەرامان، خەم مەخۆ
(قادر) و (خدر) و ئەوانەی لافی دۆستی لێدەدەن
دێنە بەردەرگات هەموویان بێ سەروپان، خەم مەخۆ
(فاتیحی)، گردئاشەوان زۆر سەیرە ئەمما ڕۆژگار
هەلدەکا سۆزەی شەمالی بەر بەیانان، خەم مەخۆ

**١٩٩٤/٤/٢٩ گردئاشەوان**

# زستان

حـەمـدو سـەنـا بـۆ بـاری، چـەنـد جـوانـە کـاروبـاری
کـوردسـتـان سـپـی پـۆش بـوو، سـەحـراوو لـێـڕەواری
بـەفـرو شـکـسـتو بـەسـتـە، دنـیـایـەکـی سـڕو سـارد
زریـانـە سـاردو سـەخـتـە، شـەمـالـە پـێـی دەبـاری
ئـەو سـالـە چـی بـە گـەل کـرد، خـەلاس بـوو دانـەوێـڵـە
هـەر لایـە بـۆی دەچـی تـۆ، گـریـانـە، شـیـنو زاری
یـەك کـۆڵـەبـاری پـشـتـی، فـڕێ دەدا لـە شـاخـان
یـەك پـالـەوانـی ڕۆژە، دیـارە شـوێـنـەواری
زسـتـانـی وا بـەشـیـددەت، نـەمـدیـوە زۆر لـە مـێـژە
دارو درەخـتـی فـەوتـانـد، کـوا سـێـوو کـوا هـەنـاری ؟
ئەو بەفـرە قـورسو سـەخـتـە، شـکـانـدی دارتـەلـی بـەرق
(لاجـان)ی بـێ بـەرق کـرد، تـاریـکـە دێ وو شـاری
مـاشـێـنـی خـەتـتـی دێـهـات، بـە زۆری حـەبـسـی مـالـن
زۆر سـەخـتو تـووشـە ڕێـگـا، نـەمـاوە ئـاسـەواری
تا بیستو پێنجی دەی مانـگ، دنـیـا وەکو بـەهـەشـت بـوو
ئـەو خـۆشـیـە بـوو بـە تـالـی، دڕا کـەوای هـەژاری
مـانـگـی پـیـرۆزی ڕۆژوو، ڕۆژێـك نـەبـوو نـەبـارێ
لـوت چـرچو گـرژو مـۆن بـوون، سـۆفـیو مـەلاو نـەواری
بـای وەعـدە بـۆچـی نـایـەت، بـیـکـاتـە بـەزم و هـەڵـلا
وەعـدەی بـەسـەرچـوو نـایـە، دنـیـا بـە ئـیـنـتـیـزاری
کـلـك وەشـێـن بـێ زسـتـان، بـەلایـە بـۆ فـەقـیـران

ئــەوەی کــە دەولــەمــەنــدە، دژوارە ئــیــش‌و کــاری
خەلاس بوو قـووتـی زسـتـان، مـالات هـەمـوو بـەقـڕ چـوو
هــاوارو دادەڕۆیــە، جــا چــۆن بچــیــنــە واری!!
(تـرێـل)ی کـا بـەشـەسـتـە، بـۆ وێـنـجـە هـەر مـەپـرسـە
ئـەمـڕۆکـە گـەورە مـالان، کـەوتـوونـە بـێ قـەراری
بـۆ یـادی جـەژنـی نـەورۆز، بـولـبـول بـە نـالـەنـالـە
پـڕ بـەفـرە دەشـت‌و سـەحـرا، تـۆرا لـە بـاخ هـوزاری
شـێـواوە حـالـی چـیـمـەن، گـولـزارە بـێ گـوڵ‌و بـۆن
نـە قـومـریـیـەو نـە شـاهـێـن، نـە بـازی کـۆهـساری
کوێستانی خـۆش‌و زەنـوێـر، بـۆ کـاتـی گـەشـت‌و سـەیـران
ئـێـسـتـاکـە بـۆتـە دۆزەخ، پـڕ بـەفـرە بـەر نسـاری
خـولـدی بـەریـن بـوو جـاران، شـاخ‌و چـیـاوو دۆڵـی
بـەهـەشـتـی ڕووی زەمـیـن بـوو، تـەواوی کـوردە واری
لـە (فـاتـیـحـی) مـەپـرسـن، زسـتـان دڵـی پـەشـێـوە
چـەنـد خـۆشـە نـیـشـتـمـانـم، فـەسـڵـی گـوڵ‌و بـەهـاری

۱۹۹۷/۳/۵ گردئاشەوان

- ۱۳۷۵/۱۰/۲۵= ۱۹۹۷/۱/۱۵ ئەم شیعرە بۆ زستانی ساڵی ۱۹۹۷ نوسراوە

ترێل: عارەبانەی تراکتۆر.

شەست: مەبەست شەست هەزار تمەنی ئەو کاتە.

# پیری

خـۆزگـەم بـە کـاتـی لاوی، نـەمـدی بـوو دەردی پـیـری
گـرانـە، سـەخـتـە، تـووشـە، هـەورازی دەردی پـیـری
گـەنـجـیـنـەیـی بـەقـیـمـەت، دەورانـی گـەنـجـێـتـیـیـە
نـەکـەی لـە دەسـتـەخـۆی دەی، ئـەگـەر بـەهـۆش و بـیـری
(لـیـت الشـبـاب یـعـود)، فـیـکـرێـکـی هـیـچ و پـووچـە
ڕابـردوو نـاگـەڕێـتـۆ، ئـەوەنـدە بـۆ فـەقـیـری
ئـەو کـاتـە هـەرزەکـاری، هـەرزەی دەرو دیـاری
مـەغـروورو مـەسـت و بێـهـۆش، بـە دەسـتـی دڵ ئـەسـیـری
بـە پـیـری چـت لـەدەس دێ لـە خـوردو خـەو زیـاتـر
تـا گـەنـجـی خـۆشـە تـاعـەت کـە پـیـری گـۆشـەگـیـری
ئەی پیری پـەسـتـی نـادان، ئـەی سـەرکـەشـی بـەد ئـەخـلاق
تـاکـەی بـەداوی شـەیـتـان ئـەسـیـری بـۆ زەریـری
خـۆزگـەم بـە ئـەو کـوڕانـەی بـەگـەنـجـی مـەردو ڕەنـدن
شـەو تـا بـەیـانـی دەگـریـن، تـاعـەت دەکـەن بـەژیـری
خـودایـە تـۆ پـەنـاهـی بـۆ ڕۆژی حـەشـرو نـەشـری
لـە جـەنـنـەتـێ بـەشـم دەی، هـەنـگـویـن و ئـاوو شـیـری
خـەتـام ئـەوەنـدە زۆرە، پـڕ دەشـت و کـێـوو سـەحـران
هـەر تـۆی خـەتـا دەبـەخشـی، غـەفـفـاری بـێ نـەزیـری
پـاڕانـەوەم لـە دەرگـات، بـۆ ڕۆژی تـرش و تـاڵـە
پـەنـام بـدەی لـەلای خـۆت، سـولـتـانـی بـێ وەزیـری
بە پـیـری بوومـە پـەنـدی وەسـوەسـەی نـەفـس و شـەیـتـان
فـریـام کـەوە ئـیـلاهـی هـەرتـۆی بـیـنـاو بـەسـیـری
ئـاشـوفـتـەحـاڵ و پـەسـتـم هـاوڕازی نـاکـەسـانـم
لـە کـردەوەم بـێـزارم، هـەرخـۆت بـیـنـاو خـەبـیـری

**١٩٩٢/١/١٤ گردئاشەوان**

# بەهار

نەجاتمان بوو لە زستان، شوکر گەینە بەهارێ
خەمو خەفەت باری کرد، دەکەین گاڵتەو قومارێ
نەورۆزە کاتی شادی، سەیرانی خۆشە سەحرا
سێزدەبەدەر تەواو بێ، دەچمە دیدەنی یارێ
خاڵ بەڵەك کەوتە کوێستان، لانواڵ پڕبوون لە نەسرین
ڕاوچی چوونە قەندیلی لە بۆ ڕاووشکارێ
شین بوون هەڵاڵەو بەیبوون، لەگەڵ گیابەندو خاوێ
لە کوێستانی دەزەنوێر لەدەم شەتو ڕووبارێ
وەنەوشەو سوێسنەو خاشخاش، سونبول لەگەڵ ڕیحانێ
بە بای شەماڵ ڕادەژێن گوڵاویان لێدەبارێ
قازو قورینگو شالوور، لە شەقشەی شابالیان دا
هەتا (گۆلی کابەکری) ناگرن سەبرو قەرارێ
تەیرو تیووری گەرمێن هاتن بەرەو کوێستانێ
تا نەچنە (بەحری خوێیە) وچان نادەن چ جارێ
کەوی چیاو نزاران هەموو سەرخۆشو مەستن
بولبول کەوتۆتە نالین، لەسەر گولی هەنارێ
یاران بەهاری ئەمساڵ بۆنی بەهەشتی لێدێ
گوڵاڵەسوورە سوور بوون، لە هەر گۆشەو کەنارێ
لە گرموهۆڕی هەوران، لە هاڕەی دەشەماڵی
دونیا هەموو سووربووە، بە گوڵاڵەی بەهارێ

کـەمـاو مـەنـدۆکو ڕێـواس، کـوڕادەو هـەڵـزو بـیـزا
لـەبـن ڕنـووی دەبـەفـران، سـەر دێـنـنـەدەر بـەجـاریٚ
لە تـیـلـەگـی کـوێستـانـان، شـەونـم لـە سـەر پـەڕەی گـوڵ
بـۆنو بـەرامـی خـۆشـە، شـەمـاڵ هـێـنـایـە خـواریٚ
شـێـتو شـەیـدایـە بـولـبـول، لـە دووریـی بـاخو گـولـزار
عـەتـتـاری گـولـفـرۆشـە، لـە هـەر دێـهـاتو شـاریٚ
بـەسـەر چـوو خـاکـەلـێـوە وەعـدەی مـانـگـی گـولان هـات
مـەڕداران بـەرەو کـوێسـتـان، دەبـەن هـۆبـەو هـەواریٚ
عیشقی گولان لـەسـەر دڵ، (فـاتـیـحـی) سـەخـتو تـووشـە
ئـەی دڵ بـەهـاری بـەخـتـت هـێـنـاویـە گـولـعـوزاریٚ

**١٩٩٢/٤/٢٠ گردئاشەوان**

# زستانێكی تووش

دایگرتووم بە نۆبەتێ
وەك نێوك كەوتن ناچێ
لە لاقان ڕا تا سەرم
هەمووی وەكو یەك دێشێ
مەمكی چەپم بای تێدا
چەسپم لێدا جێ بەجێ
فایدەی نەبوو هەر دێشا
بۆی ڕاكشام لە ناوجێ
كرێوەو بەفرو باكوت
ڕێی بڕی لە شارو دێ
مەترێك زیاتر باریوە
لەوانەیە دووش ببێ
كەس هاموشۆی كەس ناكا
هەفتێكە شەمالی دێ
دەركی زۆر مالان گیران
كێ دەهاواری كێ دێ
بۆ نوێژان بە حالەحاڵ
مەلا دەچێتە مزگەوتێ
كەس بەفری وای نەدیوە
ئەوەندەی وەبیرمان دێ

هـــەر دەلـــێـــن بـــەفـــری گـــەورە
وێـــش دەچـــێ وا نـــەبـــووبـــێ
گـــــورگو چــــەقــــەڵو ڕێـــوی
شـــەو دەخـــزێـــن لـــە بـــۆ نـــاو دێ
دەخـــۆن قـــازو مـــریشـــكو قـــەل
هـــەرچـــی بـــۆیـــان هـــەلـــكـــەوێ
لـــە نـــاو كـــووچـــەو كـــۆلانـــان
پـــیـــاو زۆر لـــە خـــۆی دەتـــرســـێ
بـــەن بـــــڕمــــان بــــۆتـــــە ددان
ڕۆژی حـــەشـــرەو كـــێ بـــەكـــێ
ڕێـــگـــەی ســـەردەشـــت -پـــیـــرانشـــار
كـــەچـــكـــی قـــولـــەی تـــێ نـــاچـــێ
چـــۆمـــی (ئـــاوژەڕۆ) و (لاوێـــن)
تـــا ئـــەو جـــێـــی پـــێـــی دەلـــێـــن زێ
دیـــار نـــیـــن لـــەبـــەر بـــەفـــرو ســـۆڵ
ئـــاو دەلـــێـــی مـــارە دەخـــزێ
(لاجـــان) و (شـــنـــۆ) و (ســـنـــدووس)
هـــەمـــووی هـــەر زالـــەیـــان دێ
هـــاوار دەكـــەن خـــوایـــە گـــیـــان
بـــەو بـــەفـــرە چـــیـــن بـــەســـەر دێ
ئـــەو دەشـــتـــی وا پـــانو پـــۆڕ
دەلـــێـــی زیـــوە ســـپـــی دەچـــێ

ســـەیـــری کـــەوو داڵو قـــەل
بـــەرەو خـــەزەڵـــێـــن دەفـــڕێ
زســتـــانـــی وا ســـەخـــتو تـــووش
کـــوا بـــە بـــیـــری کـــێـــدا دێ؟
دەڵـــێـــن بـــەهـــاری ئـــەمســـاڵ
وا دیـــــارە زۆر خــــۆش دەبــــێ
(نـــەقـــڵـــەکـــەیـــە پـــیـــاوی ڕووت
دەخـــەو دەبـــیـــنـــێ دەرپـــێ)

**گردئاشەوان ١٩٩٢/٢/٨**

# ماڵی دڵ

ماڵی دڵ میوانگەرە، هەر ڕۆژە دەردێ دێتە لای
بۆتە حاتەم سەد هەزار میوانی بێ قەت ناچەمێ
مووبەموو ئەندامی لەش، جێگەی نییە خەم تیا نەبێ
هەر ئەمن وەك قارەمان وێستاوم و گوێ نادەمێ
کێوی بێستوونی دڵم، فەرهادی کۆکەن نەی ڕماند
کوا بەداوی زوڵفی دولبەر، زەحمەتە بۆی ناچەمێ
نووری چاوم کەم بووە، هێزی لەشم ماتەو زەعیف
عەینی وەك قەندیلە نەمدیوە سەرم، بێ ماتەمێ
ئەو گوڕو تینەی کە هەمبوو کۆچی کرد دەرچوو لەدەس
یارەکەم ئاسکی سڵە، دەڕواو مەحاڵە نایگەمێ
هاتووە داوای سەرو ماڵی منی مەزلووم ئەکات
هێندە خوێنخۆرە، ئەوەند بێ ڕەحمە، هەرگیز نایدەمێ
خانەخوێی دەردو خەمانە (فاتیحی) لەم عەسرەدا
تامی خۆشیم قەت نەدیوەو، تازە لێوی ناگەمێ

١٩٩٧/٩/٢١ گردئاشەوان

# ( چوارین )

## ( ١ )

### نامەیەك بۆ خالیدی کوڕم

خــالــیــد کــوڕی گــەورەو ژیــرم
خــاوەن هــۆش‌و فــکــرو بــیــرم
هــیــوادارم ســەرکــەوتــووبــن
پــیــربــووم، بــۆخــۆم لــەخــۆم زویــرم

❖❖❖

کــوڕم ئــێــوەی جــگــەر گــۆشــە
بــاوك بــۆتــان بــەپــەرۆشــە
خــەڵــکــی بــەچــاکــەو بــاس بــکــەن
ئــەمــن ئــەوەنــدەم پــێــخــۆشــە

❖❖❖

دەبــێ ئــێــوەش کــوڕی چــابــن
دەگــەڵ کــاوە هــەر بــرابــن
لــە ڕۆژانــی ســەخــتو دژوار
بــۆ یــەکــتــر هــەر وەك چــرابــن

❖❖❖

یــاخــوا هــەر بــژیــن بــە خــۆشــی
دووربــن لــە بــەلاو نــاخــۆشــی
ئــەوەی ئــێــوە خــۆشــتــان دەوێ
درۆ نــەکــاو نــەتــان دۆشــی؟

(بـەکـرەی ئـاڵان) خـواسـتـوویـە ژن
مـوبـارەك بـێ لـەوی و لـە مـن
کـوڕم یـاخـوا تـۆش سـەرکـەوی
نـەتـکـەن لـۆمـە دۆسـتو دوژمـن

❖❖❖

پـیـرۆزبـێ ئـەو ژن خـواسـتـنـە
(بـەکـرە) ش وەك تـۆ کـوڕی مـنـە
ئـەی (حـەسـەنـی خـاڵ ئـۆمـەری)
نـابـزوێ بـۆتـە گـای بـنـە؟

❖❖❖

(مـەلا) گـوێچـی خـۆی گـرتـە دەست
وەکـو شـێـری نـەتـرسو مـەسـت
(مـارف) و (خـالـیـد) شـەو بـەکـێـون
وەك لـێـیـان کـرابـێ دمـبـەسـت

❖❖❖

(حـەسـەنـی بـەکـرەی ئـاڵانـی)
چـۆنـە بـەخـۆو بـە خـێـزانـی
ئـەو سـاڵ چـۆنـە لـەگـەڵ مـاشـان
پـار فـرۆشـتـنـی بـە هـەرزانـی

❖❖❖

ئـەو سـاڵ مـن تـێـرم لـە مـاشـان
خـاوەن مـاشـە عـەیـنـی پـاشـان
نـیـسـكو نـۆكو لـەپـەو بـڕوێـش
کـوا جـێـی پـەنـادانو حـاشـان؟

(حاجی سالەی لای گەلالە)
هەموو شتێکی لێ حەلالە
بولبولی گولزاری کوردە
هاوتای لەو ناوە مەحالە

❖❖❖

خۆش بێ ئەو بولبولە کوردە
ئەو پیرە بە دەستو بردە
با بخوێنێ بە ڕۆژو شەو
شاعیری خۆشناوی کوردە

❖❖❖

(پۆلا) لەی خۆشمان شاعیرە
هۆزانوانێکی ماهیرە
بۆچ لە هیچ لا دەنگی نایە
پیرەو بێ ژنەو زۆر لاغیرە

❖❖❖

سەرمای ئەو ساڵ تەزاندوویە
زستانێ سەرما بردوویە
دەردی گەورەی هەر ئەوەیە
چەند ساڵە بێ کەیبانوویە

❖❖❖

(حەمەی برا) چۆنە حالی؟
مەلاژن ساغە نا نالی؟
داوا لە خوای گەورە دەکەم
لێی تێك نەچێ حاڵو بالی

(عـەبـولـە پـنـەیـە شـێـخ رەسـوڵ)
دوعـــای گـــیـــرا دەبـــێو قـــبـــوڵ
چـاکـی گـرتـوە تـێـکـی نـــەدەی
دەتـــرازێ بـــکـــەی جـــولـــەجـــووڵ

❖❖❖

پـیـاوی چـاك بـە لـە بـۆ پـەلـووی
دۆسـتـی بـە ڕاسـتـی هـەر ئـەتـووی
هـەولـێـك بـدە بـۆ ئـەو حـەمـەی
پـێـی بـڵـێ مـاوە (نـازیـلـە) ی زووی؟

❖❖❖

مـامـۆسـتـا (بـلـە) و (سـێـوەیسـی)
هـەر دووك شـیـرنـن وەکـو قـەیسـی
لـــەدوای دوعـــاو ســـلاوی زۆر
زۆربـــاشـــم گـــەر لـــێـــم دەپـــرســـی

❖❖❖

ئـێـسـتـاش لـە خـۆی ئـەمـیـن نـیـیـە
ئـەو مـەولـودیـەشـی کـردیـیـە
سـێـوەیسـی بـۆخـۆی دەزانـێ
کـێ بـە فـریـوی بـردیـیـە؟

❖❖❖

بـــرام بـــەفـــر هـــێـــنـــدە زۆرە
بـــۆمـــان نـــاگـــاتـــێ گـــنـــدۆرە
لـە تـرسـی سـەرمـاو بـەسـتـەلـەك
هـەنـگـویـنـمـان پـێ بـۆتـە (قـۆرە)

(مـــەلا عـــوســـمـــانـــی مـــەکـــتـــەبـــە)
لـــەگـــەڵ (شـــێـــخـــی) بـــە ئـــەدەبـــە
(شـــێـــخ حـــوســـێـــنـــی شـــێـــخ مســـتـــەفـــا)
خـــۆش ئـــەخـــلاق، شـــیـــریـــن مـــەشـــرەبـــە

❖❖❖

ئـــەو دووەم قـــەت لـــەبـــیـــرنـــاچـــن
زەحـــمـــەتـــە لـــەبـــەر دڵ لاچـــن
زۆریـــان زەحـــمـــەت بـــۆ مـــن کـــێـــشـــا
فـــیـــلـــن لـــە گـــژ هـــەرچـــی ڕاچـــن

❖❖❖

(هێـمـن( و (تـریـفـە) ش سـوورە گـولـن
شـــەوچـــرای هـــۆدەو مـــەنـــزلـــن
شـــاگـــرد یـــەكو ســـێـــن لـــە مـــەكـــتـــەب
لـــەلای (ئـــاغـــا) ش لـــە بـــەردلـــن

**۱۹۹۲/۳/۲۸گردئاشەوان**

---

**قۆرە: بەرسیلە**

**ئاغا: مامۆستا.**

( ٢ )

## زستانی ( شیوەمێرە )

زستـانـی شـیـوەمـێـرە، زریـانو سـەخـتو تـووشـە
بـێ ئـاوو حـەوزو کـانـی، پـڕ لـێـڕەوارو پـووشـە
سەهۆڵ بەندانە بەینێك، قوڕو چلپاو بە لێشاو
بەو ئاوە ساردو پیسە، هەر کۆخەو لووشمە لووشە

قەومێکی چاکی تێدا زۆر حەز دەکەن لە خێران
خەریکی تاعەتن زۆر، سەر دەبڕن گیسکە نێران
مزگەوتێکی پڕ فەرشو مجێوری پاکو خاوێن
تەراکتۆریان پێ ناوێ، ولاخیان هەن بۆ گێران

هاوینەواریان زۆرن (دۆڵ مازەلە) و (تاتکە نێر)
(تالەگەزە) و (کانی کەو) خۆشن بۆ بزنو پانێر
چڕو زەمەندو قشلاخ بێ ئاون ئەو هەوارە
لە ترۆپکی (کاسە بەردین) شوان هەلدەدێرێ تاوێر

کابان بە کەیفو دلخۆش، شوانیش فەقیرو ڕوومۆن
لە (بنەکان) ڕا پیرەپیاو، بەرەو کوێستان دەئاژۆن
میوانی قەت نەهاتوون، دژوێنو پڕ لە کێچن
بۆخۆیان لە خۆحالین، موحتاجی دوو کەچکەدۆن

پـــایــــزە واریـــان پـــڕ ئـــاوە، دێــــنــــەوە (شـــیـــوەمـــامـــە)
جـێـیـەکـی بـاسـەفـایـە، هـەمـووشـتـێـکـی بـەتـامـە
(نـەقـم بـاشـد نـە کـاشـان) نـە دێـیـەو نـە جێ هـەوار
هـەرچـی بـخـورێ لـەو گـونـدە بـە تـەبـعـی مـن حـەرامـە

**١٩٨٢/٢/٦ شیوەمێرە**

---

**گوندی شیوەمێرە: کەوتۆتە نێوان شارستانی پیرانشارو سەردەشت.**

( ٣ )

## ڕەشەباو تووتنەوان

ڕەشـەبـای تـونـدکـرد وەك چـەقـووی سـەران
هــیــچ وەپــاش نــادا لــە دەشــتو دەران
بــۆ تــووتــنو چــەرداخ وەك بــەلا وایــە
کــرێــوەی بــەخــیــز دەکــا لــەســەران

ڕەشـەبـای ئـەمـڕۆش هـەر تـونـدو تـیـژە
تـوتـنـەوان کـردیـان بـەهـەراو قـیـژە
(کـەلـە) و گـەزۆیـان لـێ بـۆتـە سـەربـار
جـا چـی پـێـوە کـەن لـە سـەربـانـیـژە

دیســان ڕەشــەبــا کــردیــە تــەپــوتــۆز
تـێـکـی دا پـەچـەی کـیـژی قـیـتو قـۆز
بەخسوس لە مەرگەو بـیـتـوێـن زۆر تـووشـە
دەڵـێـی دێـتـە دەر لـەلای (بـەردەکـۆز)

بەحـریـش بـیـتـوێـنو مـەرگـەی گـرتـە بـەر
لــە دەربــەنــدیــڕا ســەری هــاتــە دەر
(کـەنـجـاڕە) ی داگـرت هـەتـا (سـنـدۆلان)
کـەوتـنـە شـیـن فـەلای مـەنـگـوڕو پشـدەر

تــووتــنــەکــان ســاوان درەنــگ پــێــدەگــەن
کــراونــە تــووتــن چــڕگــەن و چــەقــەن
بــەخــتــی فــەلاحــەو قــەت چــاك نــاهــێــنــێ
دوژمــنــیــان بــەحــرو کــەلــەو گــەزۆکــەن

هــێــلانــەی بــەخــتــی زۆرکــەس ڕووخــاوە
گــولــی ئــاواتو بــەخــتــیــان ژاکــاوە
نەگبـەتـی بـەدبـەخـت وەك قـەل دەقـرێـنـێ
وا بــۆلای ئــێــمــەش مــلــی لــێــنــاوە

بــاراشــی زۆرە ئــەمســاڵ ئــاشــی شــەڕ
هــەر بــۆ کــوردانــە کــەوتــۆتــە ســەر گــەڕ
مــاڵو دارایــی و ســەروەتــمــان نــەمــا
گشـت بـەتـالان چـوو تـاوڵ و بـزنو مـەڕ

ئــاوایــە دەســتــی قــەهــری خــوداوەنــد
بــۆیــە دەیــنــێــرێ تــا بــیــکــاتــە پــەنــد
تــا ئــەو کــەســانــەی دوورن لــە ویــژدان
بــزانــن چــۆنــە شــیــنو زەمــاوەنــد

خــوایــە ڕەشــەبــا چــی دەکــا پــێــمــان
تــالــی کــرد لــێــمــان مــەنــزڵ و جــێــمــان
تــەلــی کــارەبــاش وەك بــەن دەپــســێــنــێ
خــۆشــی نــەهــێــشــتــوە لــە شــارو دێــمــان

( ٤ )

# بەبۆنەی بیست و پێنجی

# گەلاوێژەوە

کوردە پیرۆز بێ هەوڵو خەباتت
پیرۆز بێ فەتحی (چیانە) و (قەلات) ت
(سی و حەوت) سالە حزبی دێموکرات
وەك سەددی پۆلا بۆتە قەلاتت

دوژمن پێی وابوو کوردستان چۆڵە
بۆ جاشو پاسدار تەویلەو مۆڵە
نەیزانی دارو بەردی کوردستان
دەشکێنن دەمو لووتی ئەو زۆڵە

هێزی بەرگریو پێشمەرگەو میللەت
دوژمنی گەلم دەکەن لەتو پەت
با لە جەماران هەرخۆی وەشێرێ
ڕۆژێك ڕۆڵەی کورد لە ملی دەکەن پەت

نــەمــا ئــەو ڕۆژەی کــورد وەجــاخ کــوێــر بــێ
دەســـتو پـــێ ســـپـــی چــاوەڕێــی خــێــربــێ
خــوێــنــدەواره کــورد قــەڵــەم بــەدەســتــه
بــا دوژمــن بــمــرێو لــەداخــان کــوێــربــێ

(بۆکان) و (هەوشار) (سەقز) و (مەریوان)
(سنه) و (کامیاران) (بانه) و (هەورامان)
لـه (مـهـابـاد) و (شـنـۆ) و (پـیـرانشـار)
(فـتـح الـمـبـیـن) بـوو بـۆ کـورد ڕەمـەزان

هــەر ئــاوەدان بــێ ئــەلــحــەق کــارەســات
لــەو هــەمــوو جــاشو پــاســدارەی دەهــات
لـــه ســـەدی هـــەر دەی خـــەلاســـی دەبـــوو
کــوردەو دوژمــنــی خــۆی نــادا نــەجــات

هـەر کـەس بـەخـوێـنـی سـوور بـکـا خـاکـی
زیـارەتـگـای خـەڵـکـه سـەرگـڵـکـۆی پـاکـی
کـوێـرەڕێـی پـیـسـه پـڕ هـەورازو لـێـژ
ڕێـی دێـمـوکـرات دەشـت، کـاکـی بـەکـاکـی

کـوردە پـیـرۆز بـێ جـێـژنـی گـەلاوێـژ
بـریـنـی دلان گـشـت دەکـا سـارێـژ
ڕۆژی مـیـلادی حـزبـی دێـمـوکـرات
دوژمـنـی خـوێـڕی کـرد سـەرسـام و گـێـژ

کـوردە نـۆرەتـە غـیـرەت بـنـوێـنـە
مـێـشـکـی دوژمـنـی زۆردار بـپـژێـنـە
تـۆ کـوڕی کـاوەی کـوتـك بـەدەسـتـی
قـەلای زووحـاکـی زەمـان بشـکـێـنـە

بـۆ بـەرزی وەتـەن گـیـان لـەسـەر دەسـتـم
تـا ڕزگـارنـەبـێ نـابـێ ڕاوەسـتـم
بـۆ بـیـسـت و پـێـنـجـی مـانـگـی گـەلاوێـژ
بـەدڵ دەخـوێـنـم شـیـعـرو هـەڵـبـەسـتـم

بـژی پـێـشـمـەرگـەی حـزبـی دێـمـوکـرات
ئـالا هـەڵـگـری سـەربـەرزی وڵات
ئـەو ڕۆژەی کـە کـورد چـاوەڕوانـی بـوو
لـە ئـاسـۆی چـیـای کـوردسـتـان هـەلات

هـەر سـەرکـەوتـوو بێ حـزبـی گـەلـی کـورد
ئـەو کـوردەی دوژمـن وەك خـۆڵ دەکـا ورد
بـمـرێ ئـەو کـەسـەی نـاحـەزی کـوردە
شـادبـێ ئـەو کـوڕەی لـە ڕێـی گـەلـدا مـرد

**١٩٨٢/٨/٢١ ئاڵواتان**

( ٥ )

# چەند چوارینەیەك

استغفرالله لە کاری نابار
سەلاوەت لەسەر سەروەری نازدار
خوایە دەفعەکەی لەسەر گەلی کورد
سەددامی زۆڵو زالمی غەددار
**کەنجاڕێ** ١٩٨٧/٣/٣

چەند ساڵ تەواوە پێن دەفرۆشی شەڕ
پیرە دالاشی کەلاك خۆری گەڕ
خوایە شەڕفرۆش تەفروتونا کەی
جێی جەهەنەنەم بێ زۆرداری بەدفەڕ
**کەنجاڕێ** ١٩٨٧/٣/٤

سەددامی خوێنخۆر سازی کرد گێچەڵ
دەیگوت کێ بۆم دێ لە بۆ شەڕە کەڵ
هەر سمکۆلیەتی بۆ شەڕو دەعوا
بێ کەلاك نازی وەك ڕێویو چەقەڵ
**کەنجاڕێ** ١٩٨٧/٣/٢

چـــوومـــه قـــەڵادزه بـــاران دەبـــاری
ئـاو لـه کـێـوو دەشـت چـاك بـبـوو جـاری
مـەنـدایـی بـەحـر گـەیشـتـه دەربـەنـد
تـوتـنـەوان کـردیـان بـەشـیـن‌و زاری
**کەنجاڕێ** ۱۹۸۷/۲/۲۸

جومعەو سێ شەممه هەر بەڕێکەوتە
تەڕ، کە ئاگری گرت هەر وەکو نەوتە
ژوورێکمان هەیە وەك سەهۆڵ خانە
سوێندت بۆدەخۆم دەڵێی ئەشکەوتە
**کەنجاڕێ** ۱۹۸۷/۲/۲۷

شـــەمـــاڵ‌و گـــرمـــەی هـــەوران
کـــردیـــانـــه بـــاوو بـــۆران
شـــەمـــاڵ کـــەلـــی ڕادەدا
بـــانـــگـــێـــڕ لـــەگـــەڵ بـــاگـــردان
**کەنجاڕێ** ۱۹۸۷/۲/۲۷

زەردەی مـــام گـــردە دۆشـــاو؟
قســـه ســـەیـــرەو گـــۆلـــەپـــیـــاو
هـــەرگـــیـــز بـــەلایـــدا نـــایـــه
دۆی هـــەبـــێ نـــاخـــوا مـــاســـتـــاو
**کەنجاڕێ** ۱۹۸۷/۲/۱۷

مـــالـــی زۆرو پـــیـــس بـــەکـــارت نـــایـــە
مـــالـــی شـــەیـــتـــانـــەو غـــەزەبـــی خـــوایـــە
مـــاڵ ئـــەومـــالـــەیـــە بـــۆتـــۆو بـــۆ گـــەل بـــێ
نـــەی خـــۆی نـــەیـــبـــەخشـــی دەردو بـــەلایـــە

❖❖❖

گـــەنـــجـــی قـــارون و بـــەهـــەشـــتـــی شـــەدداد
عـــیـــشـــقـــی مـــەجـــنـــوون و کـــۆشـــکـــەکـــەی فـــەرهـــاد
وەك بـــلـــقـــی ســـەرئـــاو بـــە بـــایـــەك لاچـــوون
ئـــەی دنـــیـــای فـــانـــی هـــەی دادو بـــێـــداد

❖❖❖

ســـەربـــەرزیـــت دەوێ بـــۆ دیـــن و دنـــیـــات
بـــۆ قـــەومـــی هـــەژار خـــۆت بـــکـــە قـــەلات
لـــەپـــێـــنـــاو گـــەلـــت گـــیـــانـــت فـــیـــداکـــە
ئـــەو کـــاتـــە مـــەردیو دەگـــەی بـــەئـــاوات

❖❖❖

ڕاوچـــی بـــۆیـــە کـــەو دادەنـــێ بـــۆ کـــەو
تـــابـــۆی پـــەیـــداکـــا گـــۆشـــتـــێـــکـــی قـــەلـــەو
کـــوردیـــش وەکـــو کـــەو بـــۆ یـــەك دەخـــوێـــنـــن
بـــۆیـــە وا ڕۆژیـــان تـــاریـــکـــە وەك شـــەو

❖❖❖

مـــیـــلـــلـــەتـــان هـــەمـــوو بـــە مـــافـــیـــان شـــاد بـــوون
لـــە ژێـــر دەســـتـــەیـــیو دیـــلـــی ئـــازاد بـــوون
کـــوردە هـــەر ئـــەتـــۆ بـــێـــبـــەش مـــایـــەوە
گـــەرچـــی زۆر کـــۆشـــکـــی زۆردار بـــەربـــاد بـــوون

گــەلــی فــەلــەســتــیــن هــەر بــەدارو بــەرد
شــەڕیــانــە لــەگــەڵ جــوولــەکــەی نــامــەرد
دەنــــگــــی دایــــەوە دونــــیــــا ســــەرانســــەر
نــامــەرد هــەر دیــلــەو هــەرســەربــەرزە مــەرد

❖❖❖

بــە نــووشــتــەو گشــتــەك نــەخــۆش نــاگــرێ چــار
گــــەر مــــار دەکــــووژی ڕۆبــــە بــــەردو و دار
مــەســەلــەی کــوردە جــوانــەو بــەجــێــیــە
چــل ڕۆژە عــومــری ســەگــی شــێــتو هــار

**کەنجاڕێ ١٩٨٩/١/١٨**

---

ڕۆبە..تاودەیە، دەست بدەیە.

# ( پێنج خشتەکیی )

## ( ١ )

## پێنج خشتەکیی لەسەر هەڵبەستێکی ( فەوزی )

دەروون وەك کـوورەیـی ئـاگـر گـڕی گـرتـوە لـە هـەر لایـە
بەشەوقی عەشـقـی یـار مـەسـتـە، بـەسـەد لـوقـمـان دەوای نـایـە
بـەزاهـیـر چـۆن دەبـیـنـێ چـاو بـە بـاتـیـن دا یـەقـیـن وایـە
(لەنەشئەی فەیزی عیشـقـی فـەخـری عـالـەم دڵ مـوسـەففـایـە
عـەجـەب بـالایـە ڕووتـبـەی عـیـشـقـم‌و نـەفسـم تـەوەللایـە)

خودا بمخەیتـە جـەنـنـەت نـازو نـیـعـمـەت بێ، نـەتـرس‌و بـیـم
ئـەلـەو مـەیـدانـەدا کـەوتـووم کـە نـازانـم چـلـۆن‌و چـیـم
بـەدووربـیـنـی حـەقـیـقـەت لـەو بـیـابـانـە کـە تـێـفـکـریـم
(مەقامی عـاریـفـان بێ زەحـمـەت‌و ڕەنـج‌و مـەشـەقـقـەت دیـم
لـە زومـرەی عـاشـقـانـم بـۆیـە عـالـەم لـێـم تـەبـەڕڕایـە)

لـە سـایـەی لـوتـفـی شـای لـەولاك، شـەهـم پـیـری کـەرامـاتـە
لە پـەردەی عـیـسـمـەتـا مـەسـتـە، مـوقـیـمـی بـاخـی جـەنـنـاتـە
مـەلـێـن تـۆ سـەرسـەریـی جـێـگـەت بـیـابـان‌و خـەرابـاتـە
(لـە هـەرچـی ڕوو دەکـەم وەك ڕۆژ عـەیـانـە چـی ڕمـوزاتـە
لە تائیـف سـەر بـەسـەر مـوسـتـەغـریـقـی زیـکـری "هـوالله" یـە)

ئـەوەی مـەسـتـی حـەقـیـقـی بێ، لـەلای خـاکـە دوڕو گـەوهـەر
تـەمـاشـا چـەنـد بـەتـەئسیـرە، سـەدای یـا فـەردو یـا ئـەکـبـەر
شـەوی تـار ڕۆژی بـەخـتـم بـوو، هـەتـا یـارم نـەهـاتـبـۆ دەر
(لـە بـامـی عـەرشـەوە پـەردەی حـیـجـابـم لا درا یـەکسـەر
ڕمـوزاتـی حـەقـایـق شـوعـلـە بـەخشـە دڵ تـەسـەلـلایـە)

گـەهێ گـریـانـە پـیـشـەی مـن، گـەهێ مـەسـروورم و خـەنـدان
گـەهێ مـەسـتـی تـەجـەلـلاتـم، دەخـوێـنـم بـەسـتـەوو بـەنـدان
گـەلێ بـالاتـرە جـێـگـەم، لـە عـەرش‌و کـورسـی سـەد چـەنـدان
(لە مەیخانەی حەقیقەت، بـوومـە ساقـی مـەجـلـیـسـی ڕەنـدان
لە حەلقەی دائیرەی عوششاق، لە بـەس جـێـگـەم مـوعـەلـلایـە)

لـەکـێ داوا دەکـەم غـەیـرەز لـە زاتـی تـۆ ئـەمـن تـەوفـیـق
لـە تـۆ زیـاتـر نـیـیـە یـارەب ئـەنـیـسـم بـۆم بـکـە تـەسـدیـق
لە ڕێی کەشف‌و کەرامات بوونەتە پیاو، چەندەها زەندیق
(کەسێ شوغلی مەحببەت بێ، دەبێ وەسلی بەهەق تەحقیق
سەراحەت پێت دەڵێم خالی، لە هەر نوکتەو موعەممایە)

وەرە ئـەو مـاڵ‌و دارایـی هـەتـە، پـاکـی بـکـە بـەش بـەش
فـڕێ دە ئـارەزووت، دنـیـا بـەکـارنـایـەت بـەحـیـلـەو غـەش
کەرەمکە با لـە فـەیـزت (فـاتـیـحـی) هـەرگـیـز نـەبێ بێ بـەش
(لە موژدەی ئەم خەلاتە خوا بەتۆی دا موزنیبی ڕووڕەش
دەبێ روح کەی فیدای شوبباکی ڕەوزەی ئەو شەهەنشایە)

**١٩٩٤/٩/٤ گردئاشەوان**

( ٢ )

# پێنج خشتەکیی لە سەر غەزەلی ( شەو )ی

# ( سەید کامیلی ئیمامی- ئاوات )

عاشقی ڕووی تۆم لەتاوانت دەخوێنم چەشنی کەو
چاوەکەم وەعدەی ویسالت بۆچی کردە ماهی نەو
ڕۆژی ڕووناکم شەوە، شەو لێم حەرامە خوردو خەو
(نووری ڕوخسارت وەدەرخە، دەردی بێ دەرمانە شەو
زولمەتی زولفت لەسەر ڕووتە لە ڕۆژ میوانە شەو)

بوومە ئامانجی مژۆڵو نیونیگای چاوی گەشت
ڕوحمو ئینسافو وەفا، بۆ عاشقی چارەڕەشت
خۆت دەزانی عاشقم بەو قامەتی گەردن کەشت
(دوێ، شوکر مەردانە من ڕێم بردە ناو زولفی ڕەشت
تابزانن ئەهلی مولکی دڵ قەڵای مێردانە شەو)

لەرزوتا گرتوومی باریك بووم، بەچەشنی تاری مووت
بۆ وەکو جاران نەماوە، میهرو لوتفو خولقو خووت؟
سەیریکە چۆن دافەتاوە ئاشنای دەورانی زووت
(کوێرو نابیایە ئێستا ئەو لەداخی ڕۆژی ڕووت
بۆیە ڕەش پۆشو فەقیرو ماتو بەستەزمانە شەو)

جێ ژوان چۆڵە نەهاتی گەرچی پێت دابووم بەڵێن
خەو لەچاوم ناکەوێ تا (کۆو تەرازوو) دێن هەڵێن
پیاوی جەردەو دز کەلێنیان دەس کەوێ زەحمەت هەڵێن
(قەدری شەو چا بگرە چاوم، شەمعو پەروانە دەڵێن
سۆزو گریەی شەمع هەر شەو سووتنی پەروانە شەو)

سۆسەنو سەروو چنارو عەرعەرو هەم داری پەڵك
ڕووبەڕووی یارم خەجالەت مانو بێ مایەو کەڵك
چۆتە ژێر هەوری دوو زولفت کولمە، خەمبارە خەڵك
(عاشقو مەعشووق لە ڕۆژدا خۆدەپارێزن لە خەڵك
گەرپەنای چاکت دەوێ بۆ ئەو دووە بڕوانە شەو)

ڕێگە پڕ هەورازو لێژە (فاتیحی) لێی سەرکەوە
وەك شەوی یەڵدا درێژە چەندە سەختە ئەو شەوە
کونجی زیندانە دڵم تاریکە تاکەی ئەو خەوە
(هەستە (کامیل) بەسیە بێداری بڕۆ لێی ڕاکەوە
تا ولات بێ دەنگو باسەو تا لە ڕۆژ میوانە شەو)

**گردئاشەوان ١٩٩٦/١١/٢٧**

( ٣ )

## پێنج خشتەکیی ( عوسمانی وەجاخی )

## لەسەر هەڵبەستێکی ( فاتیحی )

مـانـگـی تـابـانـە لـەلای مـن شـێـوەتـە زۆر جـوانـەکـەی
یـارەکـەم وەك تـازە بـووکـە نـەزمـی زولـفو شـانـەکـەی
شـێـتـی کـردم بـەو ئـیـشـارەی دای لـە بـۆ جـێـژوانـەکـەی
(تـیـری ئـەبـرۆی دا لـەجـەرگـم کـاریـیـە پـەیـکـانـەکـەی
جـەلـبـی کـردم چـاوی مـەسـتـی بـۆ دەری مـەیـخـانـەکـەی)

هـەر کـە دیـتـم عـاشـقـی بـووم، ئـیـخـتـیـارم پـێ نـەمـا
نـاسـكو نـەرمو لـەتـیـفـە هـەر وەکـو کـارگـی کـەمـا
دڵ کـە ئـازاد بـوو لـە دەردو مـیـحـنـەتو ڕەنـجو غـەمـا
(مەسـتـی کـردم مـاچـی کـولـمـەی کـەوتـمـە ڕەقسو سـەمـا
قـمـقـمـۆکـی بـادەیـە چـەنـد شـیـرنـە فـیـنـجـانـەکـەی)

ڕاسـتـە عـەودالـی ئـەوم سـاتـێ لـە دنـیـا نـاسـرەوێـم
هەر وەکو مەجنوونی شەیدا دیار نییە هـیـچ شـوێـنو جـێـم
هـەلـکـەوێ جـارێ لـە بـۆم تـا دەردی دلـمـی پـێ بـڵـێـم
(بوومە عەبدی ئالقە بـەگوێ ئـەو لـە کوێ بـێ مـن لـەوێـم
جـاروبـار وەك گـیـانـی شـیـریـن پـڕ دەکـا پـەیـمـانـەکـەی)

بەو نمەی عەتری دوو لێوی پەخشی کرد عەترو گولاو
ژیامەوە دیسان بەجارێ بەو تەنی زەعفو نەماو
هەر وەکو بازو شەهێنان کەوتمە سەر حالاتی ڕاو
(گیای وجودم بەو بەهارە ژیایەوە وەك گوڵ بە ئاو
ژەنگی سەر دڵ ڕادەماڵێ پلپلەو لەرزانەکەی)

بەو قەدو بالای نەجیبو ناسكو نازدارەکەی
ئاگری بەردا هەناوم تەرحی لەنجەو لارەکەی
دڵرفێنە دڵبەرە، جارجارە خەندەی زارەکەی
(گرمو هۆڕی هەوری نیسانو شریخەی گوارەکەی
خۆشە لە گوێم چەشنی دەنگی بازنەو پاوانەکەی)

حەسرەتی هیجرت لەسەر دڵ سەختە وا بۆتە گرێ
کێ هەیە ئەم ئێشو ئازارەی لەسەر من هەڵگرێ
خۆشی نابینم لە عومرم دەرکی مەینەت داخرێ
(پیری کردم دەردی دووری یاخودا کەس نەیگرێ
زاڵمە کەی دێ دەپرسێ شیوەنو گریانەکەی)

ساڵەهایە ڕادەبێرم هەر بەیادی ناوەکەت
دێتە بەرچاوم هەمیشە زوڵفو پرچە خاوەکەت
ڕێی نەجاتم بۆ نییە کەوتوومە نێوان داوەکەت
(مەزرەعەی دڵ وشكو بێ ئاوە لە سایەی چاوەکەت
قەت نەبوو جارێ بپرسێ حاڵەتی دێوانەکەی)

لـێـم مـەپـرسـە بـۆچـی هـێـنـدە مـاتو دامـاوو کـزم
خـۆم پـەنـا داوە لـە عـالـەم گـۆشـەگـیـرم وەك دزم
هـەر لـەپـێـنـاو تـۆیـە مـاوم، بـێ کـەسـوکـارو خـزم
(پـەرتـەو دێـوانـە ئـاسـام زۆر مـەلـوولو عـاجـزم
بـۆتـە زنـجـیـرێـك لـە مـلـدا مـاری سـەر دوو شـانـەکـەی)

پێت دەڵێن بێ سوودە (عوسمان) ئەوشتەی لە دوای شەقی
شـیـعـری ئـەفسـانـەو خـەیـالات زۆر نـەمـاوە ڕەونـەقـی
دەردی دنـیـا بـێ وەفـایـە پـیـسـە هـەربـیـنـا تـەقـی
(فـاتـیـحـی) دەورو زەمـان وەك خـۆیـەتـی تـۆ دڵ ڕەقـی
سەربەخـۆ سـووتـاوی، ئـەو شـەمـعـەو ئـەتـۆ پـەروانـەکـەی)

**١٩٩٨/٥/١٢ ئاڵواتان**

( ٤ )

# پێنج خشتەکیی لەسەر هەڵبەستێکی

## ( عەبدولقادری سەیادەت- سەیید )

ڕەنگی جارانم نییە ئەو، ئارەقەم جواناوەمە
ئاگری کوورەی دەروونم، تێکەلی سیی‌و ناوەمە
شیوەنم بۆخۆمە دەگریم، ڕۆژی لێ قەوماوەمە
(ڕەنگە وەختی مردنم بێ بۆیە لەرزو تاوەمە
دانەخالێکم نەدی گیرۆدەیی سەد داوەمە)

زۆر لە خەو بێزارم‌و ڕۆژی ڕووناکم هەر نەهات
دەوروبەر تاریکە لێم، خونچەی ژیانم بەر نەهات
شەونمی فرمێسکی چاوم نارژێ، بمبێ نەجات
(تاقە ئەستێرێك لە ئاسۆی، ئارەزووی من هەلنەهات
ڕۆژی من هاتو نەهاتە بۆیە هیوای تاوەمە)

کەوتمە گێژی دوور ولاتی لێم بەجێما ماڵ‌و زێد
بێ کەسم ئاوارە ماوم، کوا برا کوا داك‌و دێد
دەستەمۆتم هەر لەدووتم، دێم بەبێ بەندو قەلێد
(گەرچی پیربووم‌و کەنەفتم، ڕوون نییە ئاسۆی هومێد
گەر ئەجەل مۆلەت بدا ئەوڕۆو سبەینێ باوەمە)

ئـاوی چـاوم چـۆمـە خـنـكـاوم، بـەئـاوی چـاوی خـۆم
عـاشـقـی دووچـاوی مـەسـتـم، بـەسـیـە بـا هـەسـتـم بـڕۆم
لـێـم گـەڕێ دێـوانـە ئـاسـا بـا خـەمـی خـۆم خـۆم بـخـۆم
(شێتو زەنجیریم ئەمن، پوختەی ئـەویـنـی زولـفـی تـۆم
مـن گـلـەیـێـكـی كـە بـم بـێ هـەر لـە زولـفـی خـاومـە)

مـن دەلـێـم تـاجـی سـەرم تـۆی، نـابـێ تـانـەم لـێـبـدەی
لایـەقـی فـیـتـرەو زەكـاتـم گـەر دوو مـاچـم پـێ بـدەی
روحی شیریـن پـێـشـكـەشـی تـۆبـێ، كـە بـۆخـۆتـی بـبـەی
(ئـارەزوومـە نـۆبـەیـەك چـاوێـك لـە حـالـی مـن بـكـەی
بـــۆیـــە بـــۆ دیـــداری ئـــەو دوو چـــاوە چـــاومـــە)

پـێـت بـلـێـم بـۆ عـاجـزو مـاتو پـەرێشـانو كـتـم
عـەشـقـی تـۆ پـێـوەنـدی دلـمـە تـاكـو مـردن سـابـتـم
زۆر بـەنـازو عـیـشـوە ئـەمـڕۆ، سـاقـی جـانـان هـات، وتـم:
(هیچ دەزانی بۆ شتێك شێت بـوومو كـوشـتـەی دوو شـتـم
یـا لـە بـەر كـۆلـوانـە، یـا دەسـرەی لـە مـل هـالاومـە)

بـولـبـولـی شـەیـدا دەنـالـێ، پـێـت دەلـێ گـەر عـاقـلـی
بۆچی وەك من شـێـتو شـەیـدای، چـیـمـەنو بـاخو گـولـی
(فـاتـیـحـی) لـەو شـەرحو بـەسـتـە، دیـارە تـۆ زۆر غـافـلـی
(گـەر دەپـرسـی كـێـیـە واجـوان بـاسـدەكـا دەردی دلـی
پـیـرو زوڕهـانـم لـە دەس ئـەو دەردە (سـەیـیـد) نـاومـە

**گردئـاشەوان ١٩٨٨/٥/٢**

---

**سەيد عەبدولقادری سەيادەت- سەييد: لە ساڵی ١٩٢٩ لە دايكبووە و لە ساڵی ١٩٩٩ كۆچی دوايی كردووەو لە گوندی ( تورجان ) ی سەر بە شارستانی مەهاباد بەخاك سپێردراوە. ديوانە شيعرێكی چاپكراوی هەيە بە ناوی ( چيمەن و چيا ) لەگەڵ شاعير زۆر دۆست و هاوڕێ بوون.**

( ٥ )

# پێنج خشتەکیی لەسەر هەڵبەستێکی

# ( سەید عەبدولقادری سەیادەت- سەیید )

وجوودت بۆ منی خەستە دەوای دوکتۆری مومتازە
بەبێ بۆنی هەناسەی تۆ لەمێژە سینە ناسازە
بکە روحمێ بە حالم، گوێگرە لەو سازو ئاوازە
(براکەم کاك (جەمیل) بیرت دەکەم بێ حەددو ئەندازە
وەرە، دەرگی دلم بۆ خۆشەویستان رۆژو شەو وازە)

ئەگەر باوەڕ دەکەی زیندانی قەسرە لای من ئەو باغە
هەموو ئەعزای وجوودم بۆت دەنالێو ئێستە ناساغە
ئەبەد ڕوومان لەلا ناکەن، ئەوەی پێم دۆستە قاچاغە
(دلم بەینێکە غەم دایگرتووە وەك ئاوری داغە
مەگەر تۆ ئاوی پێداکەی بە شێعرێکی تەڕورتازە)

موعەممایەك لە دلمایە دەبێ کێ بێ هەلی بێنێ
بە لوقمان ناکرێ چارەی هەزار دەرزیو دەوا بێنێ
مەگەر دۆستێکی وەك تۆ ئەو تەلەسمەی دلمە بشکێنێ
(بە تاری زولفی یار بەندە دلم بۆیە دەنالێنێ
ئەگەر سێ تارەکەی نەپسێ نەواکەی زەمزەمەی سازە)

لـە نـێـو بـاخچـەی دلـم سـەوزە هـەزاران سـور گـولـی سـاوا
هـەمـووی بـۆوەی دەبـێ بـیـکـەی بـە دیـاری حـیـجلـە بـۆ زاوا
ئـومـێـدم قـەتـعـە لـەوخـەلـکـە لـە کـەس نـاکـەم بـرام داوا
(ئـەگـەرچـی مـالـەکـەم کـۆنـەو بچـوکـە مـالـی دڵ ئـاوا
بـەزاهـیـر تـەنـگو بـێ ئـاوایـە ئـەمـما دەسـتو دڵ وازە)

وەرە بـخـوێـنـە وەك بـولـبـول لەسـەر پـەلـك و چـلـووکـی گـوڵ
وەکو باخـی بـەهـەشـت خـۆشـکـە مـەکانو حـەوشـەوو مـەنـزڵ
لە دووریی تـۆ گـریـنـم دێ، گـریـنـی چـی؟ هـەمـووی هـەر کـوڵ
(بـراکـانـت لـەگـەڵ خـۆت بـێـنـە بـۆ ڕازو نـیـازی دڵ
کە مەحفەل شەمعی پێداویستە، شـەمـعیش مـەحـرەمـی ڕازە)

وەهـا بـاریـكو بـێـهـێـزم ڕەقو تـەق هـەر وەکـو زەرگـم
بـەهـاری عـومـری مـن ڕۆیـی ئـەوا هـات (فـاتـیـحـی) مـەرگـم
لـیـبـاسـێـکـی سـپـی سـاز کـەن بـرا بـۆ کـفـنو بـۆ بـەرگـم
(بـەدوودی سـیـنـەمـا دیـارە کـولـیـوە ئـاوری جـەرگـم
مـنـەت نـاکـەم لـەسـەر تـۆ گـەر بـلـێـم دۆکـولـیـوەکـەم سـازە)

**٢٠٠٠/٣/٢٦ گردئاشەوان**

( ٦ )

# پێنج خشتەکیی لەسەر هەڵبەستێکی

## ( حەقیقی )

خۆشەویستی منی بێچارەیە ئەو (قالە ڕەشە)
قەت هەدادانی نییە عەینی ولاغی هەلەشە
چاوەکەم بەسیە بەناز مەیکوژە ئەو مل بەهەشە
(خەتو خالت بەخودا فیتنەیی هیندو حەبەشە
ئافەتی دینو دلە ڕەونەقی ئەو کولمە گەشە)

قابیزی ڕوحی منی مایەیی دەردو ئەلەمی
شەکرو هەنگوینو نەبات بۆمەیە هەر دەردو خەمی
سەرو مالم بە فیدای قامەتی بەرزی عەلەمی
(خەلەلی چینو چەگول، شۆڕشی ڕۆمو عەجەمی
لەسەر ئاشوبیی زولفت، لە هەمووی کەشمەکەشە)

بۆ بەگورگاوڕ ئەکوژی منی بەدبەختی هەژار؟
بۆچی بۆ کوشتنی من زولفو کەزیت دا لە قەتار؟
گەوهەرە ئەو گولە نەخشینە مەمی سێوو هەنار
( چاوت ئەر نێرگسو شەهلا نییە بۆ هێندە خومار؟
پەرچەمت گەر شەوی یەلدانییە بۆ هێندە ڕەشە؟)

بـۆ دەوای زامـی دەروون، بـمـدەیـە مـاچـی دەمـەکـەت
سـیـنـەکـەت بـاخـە وەکـو گـەوهـەرە جـووتـە مـەمـەکـەت
نـەرمو شـل لـێـكو لـەبـار، سـەروی ڕەوانـە قـەدەکـەت
(زیـنـەتـی کـولـمـەتـە لـەرزیـنـی گـولـیـنـگـی شـەدەکـەت
گـەرچـی ئـەگـریـجـەکـەتـە زیـیـنـی ئـەویـشو ئـەمـەشـە)

هەورە سـامـالـی نـەهـێـشـت نـایـەنـەدەر شـەمـس و قـەمـەر
عـەسـکـەری زولـفـی لـە سـان داوە بـەنـێـزەو بـە تـەبـەر
هـەر نـەچـم چـاکـە هـەوای تـووشـە ڕێـگـا پـڕ لـەخـەتـەر
(شـەشـدەری خـالـی سـەری کـولـمـەتـە دڵ نـایـەتـە دەر
سـەری سـەودازەدە بـێـخـود بـەتـەمـای پـێـنـجو شـەشـە)

(فـاتـیـحـی) ژیـنـی لـە دنـیـا خـەفـەتـەو دەردو کـەسـەر
ئـاوی تـالـی گـەلـێ نـۆش کـرد چ لـە ژوورو چ لـە دەر
مەرکەزی خالیی نەکرد، خوێـنـدی هـەموو شامو سـەحـەر
(بەو دوو سێ شیعرە (حەقیقـی) کـە لـە مـەیـدان چـووە دەر
تـەنـگـە جـێو لانـی، قسـەی تـۆسـەنـە، تـەبـعـی هـەلـەشـە)

**١٩٩٧/٨/١٤ گردئاشەوان**

---

قالە رەش: مەبەست ماموستا مەلا قادری نێزەییە.

## (٧)

# پێنج خشتەکی (زوودی)

# لەسەر هەڵبەستێکی (فاتیحی)

پـــایــزم ڕابــرد نـــەمــردم شــاهــی خــووبــان هــاتـــەوە
خــەم لــە داخــانــی هــەلاتو مــیــهــری یــاران هــاتــەوە
بــۆنــی ڕێــحــانو وەنـــەوشـــەی جــۆیــیــبــاران هــاتــەوە
(ئــەی ڕەفــیــقــان مــوژدەبێ ســەروی خــەرامــان هــاتــەوە
بــولــبــولــی بــاغو چــەمــەن، خــونچــەی بــەهــاران هــاتــەوە)

وەرنـە سـەیری باخو گولشەن، ئـەوڕۆ گـوڵ بـەرگـی وەرانـد
عیشقی بولبول هاتە جونبوش، سەرچلی لێ هـەڵـپـسـانـد
خۆش بـەحـالـی مـن نـەمـردم دلـبـەرم وەعـدەی گـەیـانـد
(یــاری نــازدارو نــەجــیــبو ڕوو بــەخــالــم خــۆی نــوانــد
قــومــری نــێــو گــولــزارو گــولشــەن، یــاری جــاران هــاتــەوە)

ئــەی ڕەفــیــقــانــم ئــەواهــات دلــبـــەری نـــازك بـــەدەن
خونچەلامل کەچ لەڕووی ئەو لار ئـەبێ سـەروی سـەمـەن
ساقـیـان بـا مـەی بـگـێـڕن، مـوتـریـبـان نـەی لـێـبـدەن
(ئــافــتــابــی عــالــەم ئــارا ئــاســکــی چــیــنو خــوتــەن
یوسفی میسرە بـە شـەوکـەت، ڕوو بـە کـەنـعـان هـاتـەوە)

هەر بە مـوژدەی هاتنی دلداری باڵا عەرعەرم
گەر نیساری مەقدەمی ڕێگەی نەکەم ماڵو سەرم
دوور لە عیشقم بێ وەفامە، هەرزەمە بەدگۆ هەرم
(سوخمەئالی دیدەکاڵ، سیمینعوزارو دلبەرم
با هەزاران نازو عیشوە، گوارە لەرزان هاتەوە)

تاقی دەهرە دلبەری من سەرگەلەی ڕۆمو عەجەم
وا بەوردی ڕۆژو شەو هەرچی موتالای لێدەکەم
تاقەتی تەبعم نییە تەوسیفی چاوێکی بدەم
(چاو کەژاڵ، لامل بەخاڵ، ساحەب جەماڵو خونچەدەم
موو کەمەر، شیرین نەزەر، شەمعی شەبوستان هاتەوە)

خۆشە ئەمجارەش گولم هات بۆ شیفای دەردو ئەلەم
دام لە موژدەی گیانی شیرین، گیانو دڵ، سەر تا قەدەم
شەرتە تاهەم دامەنی عیشقی لە دەستم بەرنەدەم
(بۆ شەوی هیجرانو دووری، کۆچی کرد کاروانی خەم
زولمەتو تاریکی لاچوو، ماهی تابان هاتەوە)

دەست لەسەر سینەی حەبیبم، دەم لەسەر سەفحەی جەبین
با ڕەقیب بمرێ مەحالە دەست لە یەکتر هەلگرین
ڕایجە بازاڕی شادی، تێکچووە ئاهەنگی شین
( شای شەکەر لێوان بە خەندە هاتە باخ بۆ گولچنین
ئەی برایان بوو بە خۆشی، گوڵ لە باخان هاتەوە)

دوژمــنــم هــەقــیــە لــەخــۆشــی مــن بــکــا گــریــانو کــوڵ
بــولــبــولــی عــیــشــقــم گــەیــشــتــە وەسـلـی گـولـزار چـڵ بـە چـڵ
مــەرهــەمــی هــیــوام شــیــفــای بــەخشــی بــەزامــی جــەرگو دڵ
(قــافــلــەی عــەتــرو عــەبــیــرو ســونــبــولو ڕەیــحــانو گــوڵ
شــۆخــەکــەی مــاچــیــنو چــیــن، کــاکــۆڵ پــەرێشــان هــاتــەوە)

ئــەو شــەوەی هــەنــگــامــی دەورو دەرسو ئــەزکــارو ســەلام
بــێ ئــەوەی گــەر مــونــتــەزیــر بــم هــاتــیــفــێــك پــێــیــدام وەلام
(زوودیــا) جــێــژنــی بــەراتــە ســەهــمــی کــافــیــت گــرت، بــەلام
(چـاوەڕێ بــوو (فــاتــیــحــی) هــەردەم وەکــو عــەبــدو غــولام
ســەد شــوکــر دیــســان ئــومــێــدی قــەلــبــی بــریــان هــاتــەوە)

( ٨ )

# پێنج خشتەکی ( زوودی )

# لەسەر غەزەلێکی فاتیحی

مــن کــە بــێ مــایــەو هــەژارم، مــاڵو ســامــانــم بــەســە
مــوونســی فــیــکــرو خــەیــالــی کــونــجــی هــیــجــرانــم بــەســە
بــەس دلــم بشــکــێــنــە، گــریــەی بــێ وچــانــدانــم بــەســە
(چــاوەڕێــم گــەر یــار کــەرەمــکــا، مــاچــی لــێــوانــم بــەســە
پــێــکــەنــیــنــی زاری خــونچــەی کــیــژی کــوردانــم بــەســە)

چــاوەکــەم لــەو ڕۆژە دی، ئــەو ڕۆژ و شــەو تــۆرا لــە خــەو
هــەروەکــو گــۆشــەی خــەیــالــم، قــەت جــودانــابــێ لــە ئــەو
ئەی دوو کولمەت وەك گوڵو قــەوسی دو ئــەبــرۆت مــاهــی نــەو
(عــاشــقــی دوو چــاوی کــالــم، بــێ قــەرارم ڕۆژو شــەو
بــۆ تــەنــافــی گــەردنــم، داو، داوی زوولــفــانــم بــەســە)

ســەد هــەزار دولــبــەر کــە بــۆم ئــامــادە بــێ مــن نــامــەوێ
نــێــوی دلــدارم بــەســە هــەرگــیــز لــە زارم نــاکــەوێ
مــن لــە بــۆ دڵ دڵ لــەبــۆ گــوڵ، هــەر دەگــریــەو نــاخــەوێ
(دڵ وەکــو مــنــدالــی ســاوا، شــەکــرو نــوقــلــی لــێــم دەوێ
شــەهــدی لــێــوی دلــبــەری ســەروی خــەرامــانــم بــەســە)

بــێ تــەمــاشــای بــاخو گــولشــەن، لــەززەتــم نــاوێ ئــەمــن
بــێ مــەیو مــەیــخــانــە هــەرگــیــز عــیــززەتــم نــاوێ ئــەمــن
تــاجو تــەخــتــی پــادشــاهــیو شــەوکــەتــم نــاوێ ئــەمــن
(حــۆریــیو قــەســرو قســووری جــەنــنــەتــم نــاوێ ئــەمــن
گــولــڕوخــی شــیــریــن قــەدی ڕووم‌ـاهــی تــابــانــم بــەســە)

مــن کــە عــەبــدێکــی مــوتــیــعــم، بــمــکــوژن فــەرمــان بــەرم
چی دەبــێ ڕوحــمــێ بــەمــن کــا، ئــەو گــولــی خــۆش مــەنــزەرم
ســەبــری ئــەیــووبــم نــیــیــە، دەردی فــیــراقــی دەربــەرم
( کــوێــرو نــابــیــنــاو خــەمــیــنــم، مــن لــە دووری دلــبــەرم
هــەر وەکــو یــەعــقــوب جــەمــالــی مــاهــی تــابــانــم بــەســە)

دلــبــەرم وای کــرد لــە مــن هــیــچ هــێــزی ئــەنــدامــم نــەمــا
جــەرگــی لــەتــلــەت کــردو ڕۆیــی، مــەرهــەمــی زامــم نــەمــا
ئــارەزوو و ئــامــالو ئــومــێــدێــکــی فــەرجــامــم نــەمــا
( ئــەی فــەلــەك تــاکــەی بــنــالــم، ســەبــرو ئــارامــم نــەمــا
یــاری بــالا عــەرعــەری خــۆش عــەهــدو پــەیــمــانــم بــەســە)

بــۆتــە هــاوڕێــم ئــاهــی ســەردو، هــەمــدەمــم ئــەشــکــی گــەرم
وشكو ڕەق بووم، بوومە قەقنەس، مــن لــە هــیــجــری دلــبــەرم
کــەس نــەبــوو خــەمــخــۆری مــن بــێ، بــێــکــەسو بــێ یــاوەرم
(مــن کــەوا پــیــرو زەعــیــفــو، بــێ دڵو ســەوداســەرم
شــیــوەنو گــریــانو نــالــەو قــەلــبــی بــریــانــم بــەســە)

من لەسەر وەعدەی غەزالی شۆخو شەنگی ڕوو بەخاڵ
دادەنیشم دەستە ئەژنۆ، دڵ بەخەم، ئاشوفتە حاڵ
وا هەمیشە چاوەڕێمە ڕۆژو حەفتەو مانگو ساڵ
(گەر گولم ڕوو کاتە مالم، دەربخا نووری جەماڵ
نانی گاڵو هەرزنو خرنووکو گەلوانم بەسە)

من بە مەئیووسی لە ڕێگەی دلبەرم بووم دیدەوان
هەر ئەوەم دی تەلعەتی کرد ڕوومەتی یاری جەوان
گاه بە ڕەنگی بەفرو خوێنین، گاه بە ڕەنگی ئەرخەوان
(دەستو دامانی گولم بووم، پێمگوت: ئەی ڕووحی ڕەوان
بۆنی عەترو میسکو عەنبەر، زوولفی سەرشانم بەسە)

چونکە (زوودی) دلشکاوو پڕهەمو خەمپەروەرە
بۆ بەهاری کولمی یاری گەرمە وەك (شەهریوەرە)
تازە ئومێدی ژیانم قەتعە، دەردم یەك سەرە
((فاتیحی) چیدی مەخۆ خەم، تۆ بلێ بەو دولبەرە
پەرچەمو ئەگریجەوو دوو ماری سەرشانم بەسە)

(٩)

# پێنج خشتەکی (مەلا محەممەد ئەمینی سەقزی- سووتاو) لەسەر هەڵبەستێکی (فاتیحی)

ڕابـــەری بـــەیـــنـــی عـــوشـــشـــاقو، مـــەلـــحـــەمـــی زامـــانـــە گـــوڵ
بـــۆ بـــڕانـــی جـــەرگـــی عـــاشـــق، حـــاجـــیـــبـــی مـــەمـــکـــانـــە گـــوڵ
لایـــقـــی دیـــاری حـــەبـــیـــبو، ئـــاشـــنـــاو دۆســـتـــانـــە گـــوڵ
(ئـــەلـــحـــەقـــی، تـــازە نـــەمـــامو بـــادەیـــی مـــەســـتـــانـــە گـــوڵ
وەك گـــولـــی ســـەر لـــێـــوەجـــۆ، شـــادابو دەم خـــەنـــدانـــە گـــوڵ)

دڵ لـــەتـــاو دووری ویـــســـالـــی، کـــەوتـــە لـــەرزەو ســـاعـــیـــقـــە
مـــەنـــعـــی نـــاکـــەم بـــا بـــســـووتـــێ چـــون ســـووتـــانـــی لایـــقـــە
ســـەرســـەریو ئـــەبـــلـــەو نـــەزانـــە شـــێـــتو ڕیـــســـواو عـــاشـــقـــە
(بـــێ وچـــان دێـــتو دەچـــێ، ڕوح وەك پـــەپـــوولـــە عـــاشـــقـــە
شـــەمـــعـــی ڕووی قـــیـــبـــلـــەی مـــورادە، پـــەرچـــەمـــی ڕیـــحـــانـــە گـــوڵ)

دوور لـــە ئـــەو مـــن هـــەر لـــە دوورۆ، شـــیـــنو زار لـــەب خـــەنـــدمـــە
وا لـــە کـــونـــجـــی حـــوجـــرە کـــەوتـــووم، زولـــفـــی ئـــەو دەس بـــەنـــدمـــە
وەســـفـــی چـــاوو کـــولـــمو لـــێـــوی شـــیـــعـــرو بـــەســـتـــەو بـــەنـــدمـــە
(خـــالـــی ســـەرلـــێـــوی وەکـــو شـــەهـــدو شـــەکـــەر پـــێـــوەنـــدمـــە
زولـــفو ئـــەگـــریـــجـــەی لـــەگـــەڵ گـــێـــلـــگـــێـــلـــە هـــەر لـــەرزانـــە گـــوڵ)

مـن بـه وێنـەی مـورغـی کـێوی، چاوی چـەشنـی بـازە ئـەو
مـن وەکـو خـاری مـوغـیلان، وەك گـولـی شـیرازە ئـەو
بـۆو دڵـەی پـەسـتو هـەژارم، هـەمـدەمو هـەمـڕازە ئـەو
(دەم بـەخـەنـدەو پـێکـەنـیـن، سـەر تـا قـەدەم هـەر نـازە ئـەو
بـۆو دڵـەی پـڕمـەیـنـەتـم، تـاقـی بـرۆی زیـنـدانـە گـوڵ)

گـەر نـەهـێـنـێ مـەرهـەمـی دڵ، بـەربـەیـان سـۆزەی شـەمـاڵ
دەبـمـە کـێوی تـوور ئـەسـووتـێـم، تـاکـو دێ کـاتـی ویـساڵ
ئـەی خـودا کـەی بـێ بـبـیـنـم، دڵـبـەرم وێـنـەی غـەزاڵ
(چـاوی کـاڵو لـێـوی ئـاڵ، خـونـچـەدەمو شـیـریـن جـەمـاڵ
لابـەری غـایـلـەو خـەیـاڵو شـاهـیـدی پـەیـمـانـە گـوڵ)

خـەو لـە چـاوم نـاکـەوێ شـەو، مـن لـەبـەر زاریو فـوغـان
ڕۆژ کـە دادێ مـەسـتو بـێ هـۆش، وام لـەنـێـو بـەحـری خـەمـان
دوێ بـەیـادی وەسـڵـی بـالای، کـەوتـمـە نـاو بـەزمـی مـوغـان
(چـوومـە بـاخو سـەیـری گـولشـەن، پـێـی گـوتـم پـیـری مـوغـان
وا لـە بـەزمـی مـەی فـرۆشـان، سـاقـیو جـانـانـە گـوڵ)

سـەبـر تـاکـەی ئـەی ڕەفـیـقـان، جـامـی ژیـنـی مـن شـکـا
کـوا حـەبـیـبـی دیـنو دنـیـام، چـاری زامـی مـن بـکـا
ڕوح ئـەکـەم شـابـاشـی بـالای، بـێـتو ئـەو داوا بـکـا
(گـەر بـە قـانـوونـی حـەبـیـبـان، ڕوو لـە حـوجـرەی مـن بـکـا
عـەیـشو نـۆش، بـۆسـەو کـەنـار، مـاچـی دەمـی هـەرزانـە گـوڵ)

سەد هەزار خۆزگەم بەکاتێ، دەس وەکو زولفی خەمی
ئەچوە سەر ئەستۆی بلووری، دەم ئەنیشتە ناو دەمی
کاتێ وەك تینووی بیابان، پڕ بەدەس گرتم مەمی
(مێخەکەو بەرمووری مووری چوونە سەر سێوی مەمی
چین بە چین زولفی درێژی عەسعەسی کولمانە گوڵ)

فیرقەتی دووچاوی مەستی، دای لە دڵ تیغی ستەم
وا لە ناو ئاوری فیراقی، هەڵپڕووزام عەینی شەم
وەك (سووتاو) خوێن دێ لە جەرگم، شەو هەتا دێ سوبح دەم
(بولبولی گولزاری عیشقم، نەغمەخوانم دەم بە دەم
(فاتیحی) خونچەی بەهارو حۆرییە، ڕیزوانە گوڵ)

( ١٠ )

# پێنج خشتەکی ( عوسمانی وەجاخی )

# لەسەرهەڵبەستێکی ( فاتیحی )

دلـبـەرم بـێ وازە ئـەمـڕۆ، حـەز بـەقـیـنو کـیـن دەکـا
مـەیـلـی جـارانـی نـەمـاوە، ئـەسـپـی فـیـرقـەت زیـن دەکـا
لـەشـکـری ئـێـشو پـەژارەم، دەس بـە تـێـکـۆشـیـن دەکـا
(دڵ لـە خـەمـدا دافـەتـاوە، یـار لـەمـن نـەفـریـن دەکـا
ڕوح لـە حـەسـرەت شـەهـدی لـێـوی، شـیـوەنو نـالـیـن دەکـا)

عـاجـزو لاتو زەبـوونـم، مـاتو بـێ هـێـزو نـەمـاو
هـەر وەکـو پـیـرێـکـی فـەڕتـووت، تـینو تـاقـەت لـێـبـڕاو
سـەرسـەریو دێـوانـە ئـاسـا، تـەن زەعـیـفو هـەلـکـزاو
(ڕوومـەتـم زەردە وەکـو بـەی، قـامـەتـم خـوارو چـەمـاو
چـاو دەڕێـژێ لـەعلو مـەرجـان، بـۆ گـولـی خـۆی شـیـن دەکـا)

ڕووتو قـووتـی عـیـشـقـی تـۆمـە، بـێ دیـنـارو درهـەمـم
نـاکـرێ ئـەسـلا عـیـلاجـی، دەردی سـەخـتو ئـەسـتـەمـم
دائـیـمـا ئـەفـکـاری یـارە، هـەمـنـشـیـنو هـەمـدەمـم
(بـۆیـە وەك فـەرهـاد لـە کـێـوی بـێـسـتـوون غـەڕقـی خـەمـم
شـیـرنـم لـە خـوا نـەتـرسـە، ڕاوی گـیـانو دیـن دەکـا)

ئەی خوا حۆری مەگەر بێ، بەو جەماڵو شێوەیە
سێوە سوورەی هەردوو مەمکی، عەینی باخی (زێوە) یە
تیری غەمزەی چاوەکانی، قاتلی ئەم نێوەیە
(دەستو پەنجەی سوورە یارم، خوێنی دلمی پێوەیە
ئەو گولە بێ ڕەحمو دینە، دەس بەدڵ ڕەنگین دەکا)

کەوکەبی بەختم نزوولە، یاری ناکا چەرخی دوون
وەك شەهیدی کەربەلا، کەوتوومە سەحنەی خاكو خوون
جاربەجار ئاه و هەناسەم، پێکەوە تێکەڵ دەبوون
(قرچە قرچی ئاهی سینەو، دووکەڵو بۆسۆی دەروون
ئەشکی گەرمو سوێرو سوورم، عالەمێ غەمگین دەکا)

هەلوەدای مەحبووبەکەی خۆم، موونسی دەشتو دەرم
شەو هەتا ڕۆژ دەستی خەمناکی دەنێمە ژێر سەرم
هەر وەها شێواوە دەورەم، دادی خۆم بۆکێ بەرم
(شەو نییە تا بەربەیانی دەس لە شیوەن هەلگرم
چوون بە عەزمی کوشتنم، ئەو پەرچەمی چین چین دەکا)

باری لێوم بەلگەیە بۆ دەردو ڕەنجو میحنەتم
خواردنم ئاواتی دووری، خوێنی جەرگە شەربەتم
عاشقم قومری سیفەت، دادو فوغانە خەسلەتم
(چەشنی مەجنوون شێتی لەیلام، دوور لە یارو عوشرەتم
بولبولی دڵ هەر دەناڵێ، گوڵ بە ئەسرین شین دەکا)

حـاکـمـی دەوران هـەمـیـشـە، ئـیـفـتـیـزاحـم پـێ دەکـا
دەسـت لـەمـن هـەڵـنـاگـرێ، وەعـدەو وەعـیـدم پـێـدەدا
نـایـەڵـێ ئـاسـوودە بـم، هـەر عـەیـبو عـارم دەردەخـا
(ئـەی فـەلـەك جـەوری زەمـانـەت، خستـە سـەرمـن بـۆیـە وا
سـاوی سـافـی ئـاسـمـانـم، هـەر بـە مـژ بـاریـن دەکـا)

دلـڕفـێـنـەی شـۆخو شـەنـگـم، گـولـعـوزاری نـازەنـیـن
ئـافـتـابـی شـەرقو غـەربـم، نـەونـەمـامـی مـەه جـەبـیـن
تـابـەکـەی لـێـم هـەڵـوەرن، فـرمـێـسـکـی گـەرمو ئـاگـریـن
(یـارەکـەی خـوێـنـخـۆرو زاڵـم، دڵـبـەری بـێ ڕەحـمو دیـن
زولـفو ئـەگـریـجـەی کـەمـەنـدی عـاشـقـی مسـکـیـن دەکـا)

بـا بـڵـێـم لـەو ڕۆژەوە، مـوشـتـاقـی وەسـڵـی ئـاشـنـام
تـەی دەکـا لـەیـلو نـەهـارو، مـانـگو سـاڵو سـوبـحو شـام
گـەرچـی تـێـپـەڕ بـوو ئـومـێـدم، زارو بـێـزارم، بـەڵام
(نـیـوە مـردوو، ڕوح لـەسـەرلـێـو، چـاوەڕێـم گـەر بـێـتـەلام
ئـەو وەکـو ئـاهـووی ڕەمـیـدە، ڕوو لـە سـەحـرای چـیـن دەکـا)

کـوڵ لـەنـاو کـورەی هـەنـاوم، وێـنـە پشـکـۆی ئـاگـرە
یـاری تـازەم لـێ بـەڵایـە، دۆسـتـی کـۆنـم چـاتـرە
پێم دەڵـێـن بـێـدەنـگبـە (عـوسـمـان)، پـێـم سکـووتـم بـاشـتـرە
((فـاتـیـحـی) بـێ سـوودە گـریـان، بـاری هـیـجـران هـەڵـگـرە
بـەخـتـی تـۆ کـەی هـاوتـەرازیـی زوهـرەوو پـەرویـن دەکـا)

( ١١ )

# پێنج خشتەکی ( مەلامحەممەد ئەمینی- سووتاو ) لەسەر هەڵبەستێکی ( فاتیحی )

بـۆ شـەفـای جـەرگـی بـڕاوم، هـاتـنـی یـارانـم بـەسـە
بـۆگـەواهـی عـیـشـقـبـازیـم، خـوێـنـی چـاوانـم بـەسـە
بـۆ شـکـانـی ژانـی سـیـنـەم، دیـتـنـی جـانـانـم بـەسـە
(چـاوەڕێـم گـەر یـار کـەرەمـکـا، مـاچـی لـێـوانـم بـەسـە
پـێـکـەنـیـنـی زاری خـونـچـەی، کـیـژی کـوردانـم بـەسـە)

لـەتـلـەتـە جـەرگـم بـە تـیـری لـەشـکـری مـوژگـانـی ئـەو
بۆ ویسالـی سـەروی ڕەعـنـای، مـن دەسـووتـێـم ڕۆژو شـەو
بولبولی خونچەی حەبـیـبـم، نـیـمـە ژیـنو خـوردو خـەو
(عـاشـقـی دوو چـاوی کـالـم، بـێ قـەرارم ڕۆژو شـەو
بـۆ تـەنـافـی گـەردنـم داو داوی زولـفـانـم بـەسـە)

ئـەشـکـی چـاوم دێ لـەسـەردا، کـاتـێ دێـتـە پـێـکـەنـیـن
بوونە دەسبەندو کەلەپچەم، زولفەکـانـی چـیـن بـەچـیـن
بۆچ ئەکەی مەنعم لە باخت یـارەکـەی بـێ ڕوحـمو دیـن؟
(بولبول ئاسا بـۆ گـولـی ڕووت هـەردەکـەم گـریـانو شـیـن
عـاشـقـی ڕووی تـۆم عـەزیـزم شـیـنو گـریـانـم بـەسـە)

یار لە باتی ماچی کولمی، دینو ئیمانی دەویٚ
دڵ لەبۆ سارێژی زامی، ماچی لێوانی دەویٚ
تەن کە پیرو نامرادە، دارو گۆچانی دەویٚ
(دڵ وەکو منداڵی ساوا، شەکرو قەندانی دەویٚ
شەهدی لێوی دلبەری سەروی خەرامانم بەسە)

سەیری گولزاری بەهارو، گولشەنم ناویٚ ئەمن
بۆنی ڕێحانو وەنەوشەو سۆسەنم ناویٚ ئەمن
گەوهەرو زێڕو منداڵو سەروەتم ناویٚ ئەمن
(حۆریو قەسرو قسووری جەننەتم ناویٚ ئەمن
گولڕوخی شیرین قەدی ڕووماهی تابانم بەسە)

قامەتی ئەلفم بەچەشنی قەوسی ئەبرۆی دلبەرم
کووڕو چەمیاوە لە جەوری دلبەری قەد عەرعەرم
لاڵو لارو خواری کردم، کردیە زووخاڵ پەیکەرم
(کوێرو نابیناو خەمینم، من لە دووری دلبەرم
هەر وەکو یەعقوب، جەمالی ماهی کەنعانم بەسە)

هێندە گریاوم بە تەنها، نووری چاوانم نەما
وا کولاوی عیشقی یارم، گۆشتو ئێسقانم نەما
ئەی خودا تاکەی بسازم، تاقەتو تابم نەما
(ئەی فەلەك تاکەی بنالم، سەبرو ئارامم نەما
یاری بالا عەرعەری خۆش عەهدو پەیمانم بەسە)

غـەرقـی بـەحـری ئـاهـی دووریـم، مـەوج ئـەدا دەورو بـەرم
قـەت نـیـیـە ڕێـگـەی خـەلاسـیـم، وا گـیـراوە شـەش دەرم
ئاهی سینەم گرتـی ئـەفلاك، بـوو بـە مـێو گشت پـەیـکـەرم
(مـن کـەوا پـیـرو زەعـیـفـو بـێ دڵو سـەودا سـەرم
شـیـوەنو گـریـانو نـالـەو قـەلـبـی بـریـانـم بـەسـە)

بوو بە قیبلـەی نـوێـژو ڕۆژووم، تـاقـی ئـەبـرۆی چـاوی کـاڵ
بوو بە ئەلقەی کەعبەتـولـلاّم زولـفـی لـوولـی وەك زووخـاڵ
گشت ئەکەم قوربـانـی چـاوی، عـیـلـمو هـۆشو گـەنـجو مـاڵ
(گـەر گـولـم ڕووکـاتـە مـالـم، دەربـخـا نـووری جـەمـاڵ
نـانـی گـاڵو هـەرزنو خـەڕنـووكو گـەلـوانـم بـەسـە)

هـەلـوەری قـەتـرەی حـەیـاکـەم وەك گـەلا، فـەسـلـی خـەزان
بوومـە پـەنـدی شـێـتو ئـەبـلـەو عـاریـفو عـامـیو جـەوان
کـاتـێ چـوومـە دەرکـی دلـبـەر بـوومـە عـەبـدو دەرکـەوان
(دەستو دامانی گولم بووم، پێمـگـووت: ئـەی ڕووحـی ڕەوان
بۆنی عەترو میـسـكو عـەنـبـەر، زولـفـی ڕەیـحـانـم بـەسـە)

مـاوەیـێـکـی زۆر لـە مـێـژە دڵ لـە دووی سـەودا سـەرە
شـێـتـی لـەیـلـم بـۆیـە شـوێـنـم، جـەنـگـەڵو دەشـتو دەرە
خـۆ (سـووتـاو) دایـم بـە هـیـوای، یـەك پـەیـامـی دلـبـەرە
( (فـاتـیـحـی) چـیـدی مـەخـۆ خـەم، تـۆ بـڵـێ بـەو دلـبـەرە
پـەرچـەمو ئـەگـریـجـەوو، دوو مـاری سـەر شـانـم بـەسـە)

( ١٢ )

# پێنج خشتەکی ( زوودی )

# لەسەر هەڵبەستێکی ( فاتیحی )

شەرتە تا دەمرم لە هیجرت، دەس لە عیشقت بەرنەدەم
ڕەنگی پیریم گرت لە دووریت، ئەی گوڵی گوڵزارەکەم
ئەی وەنەوشەی تازە خەملیوم، لە جۆگەو لێوەچەم
(مودەتێکە هەردەناڵم، بۆ گوڵی باخی ئیرەم
بۆ شەمامەی باخەڵو، زوڵفی ڕەشو، شەکراوی دەم)

یار وەکو تازە عەرووسان، بەرگی تازەی کردە بەر
هەر کە دیتم تیری ئەبرۆی، بوو لە جەرگم کاریگەر
ئەی ڕەفیقانم وەرن بۆ من بکەن شینو چەمەر
(سازی کرد بارگەوبنە، ئامادەیە گوڵ بۆ سەفەر
ئاوری سینەم لە جۆشە، چاو بەگریەو دڵ بە خەم)

ئەو هەموو نازو نیازو زوڵمە، پیشەی تازەتە
یانە هەر بۆ من هەمیشە بێوەفاییت عادەتە
تۆ کە ڕۆیی دڵ بەجێ ما تازە ژینم زەحمەتە
(زەنگی کاروانی ئەجەل زۆر خۆشترە لەو حالەتە
ئەی خودا چیم لێدەکا ئەو دلبەری ڕەعنا قەدەم)

گـیـانو دڵ پـابـەنـدە بـەو کـاکـۆڵـی خـاوەن بـەرقـی تـۆ
هـەر وەکـو هـارووتو مـارووتـم لـە چـاهـی حـەلـقـی تـۆ
تـا لـە دنـیـادا بـمـێـنـم سـوێـنـد دەخـۆم دەرحـەقـقـی تـۆ
(بـەو دوو چـاوی پـڕ لـە نـازو بـەو دلـەی پـڕ عـیـشـقـی تـۆ
بەو دوو ئەبرۆی وەك هیلالو بـەو گـولـی کـولـمـەت قـەسـەم)

بـەو جـەوانـیو دیـمـەنـی وا، بـێ نـەزیـرو فـەردی تـۆ
بـەو دەمـی وا نـازك و بـەو چـێـهـرەیـی وەك (وەرد)ی تـۆ
بـەو دوو لـێـوی پـڕ لـە خـەنـدەو گـوشـوارەی زەردی تـۆ
(بەو مـوژەی وەك نـەشـتـەرو، بـەو ڕوومـەتـی بـێـگـەردی تـۆ
بەو دوو لیمۆی نەوڕەسو بەو زاری وەك خـونـچـەت قـەسـەم)

بـەو سـفـیـدەی گـەردنو بـەو قـامـەتـی ڕازاوی تـۆ
بـەو قـەراری پـێـشـەوەو بـەو هـیـجـرەتـی نـاکـاوی تـۆ
بـەو هـەمـوو هـۆشـیـاریـیـەو بـەو عـومـری لاوو خـاوی تـۆ
(بـەو قـەدی سـەروی ڕەوانو بـەو پـەچـەی داوداوی تـۆ
بەو دوو پەنجەی وەك بلوورو بـەو دوو زولـفـانـەت قـەسـەم)

بـۆ ئـەوەی مـەیـلـی بـنـێـم، بـمـبـەن لـەسـێـدارەم بـدەن
بـا هـەزار واعـیـزو مـوفـتـی بـێـن پـەشـیـمـانـم بـکـەن
عـەهـدی خـۆم قـەت نـاشـکـێـنـم، مـن لـەگـەڵ نـاسـك بـەدەن
(تـا نـەڕۆمـە نـێـو لـەحـەد، تـەلـقـیـنو تـەکـفـیـنـم نـەکـەن
مـەیـلـی ئـەو دوو چـاوی بـازت، قـەت لـە دلـدا دەرنـەکـەم)

مۆری عیشقی تۆ لە گۆشەی، جەرگو دڵدا بۆتە هۆی
جێ نەبوونی غەیری حوببت، لانەچوونی ئارەزۆی
بمکوژی یانە دەرمکەی یا بە جێم بێڵی بڕۆی
(شەرتە تارۆژی حەشر، قیبلەی نیازم هەر ئەتۆی
هەر ئەتۆی ئاواتی دڵ ئەی لالەڕوو من تاکو هەم)

یار بە لەنجەو پێکەنین هاتو، منیش پێمگوت لەوێ
(زوودی) زامداری ئەوینی تۆیە هەرگیز ناخەوێ
دلڕەقی زۆر چاك دەزانم گەر پەکت پێ ناکەوێ
(پێیگوتم: (فاتیحی) ماچێ کافیە، چیت لێم دەوێ؟
خۆ دەزانم گەر ئەتۆ پەروانەی‌و من بوومە شەم

**١٩٦٢/١١/١٢ گوڵفەت**

## ١٣

# پێنج خشتەکی فاتیحی

### لەسەر غەزەلی (مامۆستا محەممەدی شلماشیی)

**وێڕای سوپاسی مامۆستا صەلاحەددین عەبدولقادر واعیظ ، بە پێویستی دەزانین دەقی نووسینەکەیشی لەسەر ئەم پێنج خشتەکییە لە (دیوانی فاتیحی) دا بخەینەڕوو، کە بەم شێوەیە نووسیویەتی:**

**(لە کۆتایی ساڵانی هەشتاکاندا لە سەردانێکمدا بۆ لای مامۆستا مەلا محەممەدی شلماشیی لە حوجرەکەی خۆی لە مزگەوتی حاجی محەممەد ساڵحی بۆسکانیی لە شاری سولەیمانیی، ئەم پێنج خشتەکییەی مامۆستا مەلا عەبدوڕڕەحمانی فاتیحیی بۆخوێندمەوە و منیش دەستبەجێ نووسیمەوە، ئیدی لەوکاتەوە پاراستوومە، بەڵام نە لای بنەماڵەی فاتیحیی هەیە هەتا لە دیوانی فاتیحییدا بڵاوی بکەنەوە، نە لای شلماشیی خۆیشی مابوو! شایانی باسە غەزەلەکەی شلماشیی لە ساڵی ١٩٧٣ لە نامیلکەی شیعریی (باوەشێنی دڵ)ی شلماشییدا بڵاوبووەتەوە، هەمان ساڵ فاتیحیی غەزەلەکەی شلماشیی کردووە بە پێنج خشتەکی).**

سەرم گێژە لە عەشقا بێ مەی و بەنگ
بە بێ یار لێم حەرامە کەیف و ئاهەنگ
لەدەورم کۆوەبوون خەم هەر وەکو هەنگ
( بەدایم ماتم و مەبهووت و دڵتەنگ
مەگەر ڕۆژێ کە لیمۆی بێنە بەر چەنگ)

شـــەو و ڕۆژ وا لـــە کـــۆڕی شـــیـــن و خـــەمـــدام
ئـــەگـــەر مـــەیـــلـــت هـــەبـــێ پـــێـــمـــوایـــە مـــن شـــام
ئـــــەرێ ئـــــەی شـــــاگـــــولـــــی جـــــوان دەی وەرە لام
(وەرە ئـــــەی دلـــــبـــــەری شـــــۆخ و گـــــولـــــئـــــەنـــــدام
وەرە ئـــــەی نـــــازەنـــــیـــــن، دلـــــڕەق وەکـــــو ســـــەنـــــگ)

گـوتـی پـێـم دەتـکـوژم خـوێـنـت لـەسـەر خـۆت
دەسـووتـێـنـم دلـت پـێـمـخـۆشـە بـۆسـۆت
گـوتـم قـوربـان سـەرم خسـتـە سـەر ئـەژنـۆت
(بـە تـیـلـەی چـاو و ڕەمـزی لـێـو و ئـەبـرۆت
ئـیـشـارێـکـی بـکـە بـمـکـووژە بـێ دەنـگ)

لـەبـەر تـەعـنـەی ڕەقـیـب قـەت نـەمـگـوت ئـۆخـەی
بـەهـای مـاچـێـکـە ڕۆح گـەر لـێـم قـبـولـکـەی
دلـیـش هـی خـۆتـە هـا فـەرمـوو کـە دەیـبـەی
(بـدە سـاقـیـی بـە کـوێـری حـاسـیـدان مـەی
بـدە مـوتـڕیـب لـە مـزمـار و دەف و چـەنـگ)

دەزانـــی بـــۆچـــیـــی مـــن وا بـــێ قـــەرارم؟!
وەکـــو گـــوڵ ســـیـــس و بـــێ ئـــاوی بـــەهـــارم
دەلـــێـــن تـــۆراوە یـــاری چـــاوخـــومـــارم
(دەســـا تـــوخـــوا وەرە بـــڕوانـــە یـــارم
مـــەعـــازەلـــلا چ شـــیـــریـــنـــە و گـــەنـــم ڕەنـــگ)

تـەمـاشـای یـاری مـن چـەنـد شـۆخ و ژیـرە
تـەڕ و نـەرم و سـپـیـی چەشـنـی پـەنـیـرە
لـە (سـەردەشـت)ا گـولـێـکـی بـێ نـەزیـرە
(ئـەگـەر یـەك پـێـمـبـڵـێ یـار لـێـت زویـرە
لـەپـێـش چـاوم دەبـێـتـە دێـوی ئـەرژەنـگ)

بـەتـەنـیـا (فـاتـیـحـیـی) لـەو شـارەدێـیـە
ئـەسـیـری چـاوی عـەیـیـاری خـەجـێـیـە
ئــەوەی ڕووپــۆشـی ڕووی لاداوە کـێـیــە؟!
(دەڵـێـن (شـلـمـاشـیـی) وا یـار چـاوەڕێـیـە
دەگەڵ عالەم ئیتر بۆچی دەکـەی جـەنـگ؟!)

١٩٧٣/١١/٨

# ( جووت سەروا )

## ( ١ )

## پاڕانەوە

بــەنــاوی خــودای ڕەحــمــانو ڕەحــیــم
خــاوەنــی کــەرەم، غــەفــورو کــەریــم
بـەخشـنـدەو سـەخـی بـۆ بـەنـی بـەشـەر
دانــەر بــۆ بــەشــەر، بــەهــەشــتو ســەقــەر
ســەلاوات لــەســەر بــەشــیــرو نــەزیــر
هـەم ئـالو ئـەسـحاب، خـولـەفـای ئـەمـیـر
بـووبـەکـرو عـومـەر، عـوسـمـانو حـەیـدەر
هــەر چــوار وەزیــری ڕەســولــی ســەروەر
خــوایــە بــڕژێــنــی ڕەحــمــەتو غــوفــران
بـۆ سـەر ڕێـبـەری گـەورەی ئـیـنـسو جـان
بـۆ سـەر شـاسـواری مـەیـدانـی مـەحشـەر
پـێـشـەوای روسـول سـەروەری ئـەکـبـەر
خـوایـە بـۆ خـاتـری ئـەنـبـیـای کـیـڕام
بۆ خـاتـری ئـەحـمـەد، شـای خـەیـرولـئـەنـام
بـۆ خـاتـری بـووبـەکـر، عـومـەرو عـوسـمـان
بـۆ خـاتـری عـەلـیو فـاتـیـمـەی جـەوان
بـۆ خـاتـری خـوێـنـی شـەهـیـدی مـەزلـووم

بـۆ خـاتـری هـەر چـوار پـێـشـەوای عـلـووم
خـۆشـبـە، لـە سـووچ و هـەڵـەی ڕەفـتـارم
لـە کـردەوەی خـۆم خـەجـاڵـەت بـارم
کـردەوەو پـیـشـەم، تـێـیـدا نـیـیـە چـاك
خـوایـە بـمـبـەخشـە بـە ئـەنـفـاسـی پـاك
عـومـرێـکـی زۆرم تـەی کـرد بـێ تـاعـەت
مـەغـروور و نـەزان دڵ بـێ قـەنـاعـەت
کاریان نەکرد لێـم هـیـچ مـەوعـیـزەو پـەنـد
شـەیـتـانو نـەفسـم کـردوویـانـم بـەنـد
هـەزار جـار تـۆبـەو ئـەسـتـەغـفـیـروڵـلا
هـەر ئـەتـۆم پـەنـای یـا ڕەسـوولـەڵـلا
ڕوحـمێـك بـە نـاڵـەو، بـە شـیـنو ئـاهـم
ئای چەند بەدبـەختو چـەنـد ڕوو سـیـاهـم
خـوایـە پـەنـام دەی لـە نـەفـسو شـەیـتـان
شـەیـتـانـی جـیـنـو شـەیـتـانـی ئـیـنـسـان
(فـاتـیـحـی) تـاکـەی بـەسـیـە حـیـلـەو فـێـڵ
تـاکـەی بـۆ دنـیـا سـەوداسـەریو وێـڵ

**١٩٩١/٧/٢٣ گردئاشەوان**

( ٢ )

# بۆ ( عوسمانی وەجاخی )

(ئـاغـا) نـەورۆزە دنـیـا سـەوزەو شـیـن
چـەمـەنـزار پـڕن لـە لالـەو نـەسـریـن
بـرام نـەورۆزەو سـێـزدەبـەدەر هـات
(خـانـە تـەکـانـیـیـە) لـە شـارو دێـهـات
(ئـاغـا) سـەرزەمـیـن بـاخـی بـەهـەشـتـە
خـۆشـی بـەهـاران سـەیـران و گـەشـتـە
هـاژەی شـەتـاوەو خـوڕەی ئـاو هـەڵـدێـر
بـێـری شـۆخو شـەنـگ سـازە بـۆ هـاوێـر
چـیـای کـوردسـتـان وەك کـێـوی تـوورە
بـە گـولـە مـێـلاقـەو گـڵـوکـە سـوورە
نـەرگس چاومـەسـتـەو وەنـەوشـە مـل شـۆڕ
ئـاوی بـەفـراوان دێـتـەخـوار چـۆڕچـۆڕ
کـۆتـرە نـەخشـیـنـەی بـێ خـانـەولانـە
شـەیـدای گـولـزارە لـەم کـوردسـتـانـە
(ئـازیـز) وادەی هـات بـڕۆیـن بـۆ کـوێـستـان
خـەم بـەبـادا کـەیـن لای خـۆشـەویـسـتـان
قـومـریو بـازو کـەو عـەودالـی شـاخـن
وەك مـن بـۆ لـەیـلـیـان بـە ئـاخو داخـن
هـێـلانـەی بـەخـتـیـان زسـتـان ڕووخـانـی
ڕەشـەبـای نـەگـبـەت مـەیـنـەتـی هـانـی

شەماڵ هات خەیمەی زستانی ڕووخاند
گوڵ لە باخاندا بەناز خۆی نواند
(ئاغا) بەهارەو هەمووکەس شادە
لەحەپسی زستان چەمەن ئازادە
کەژو کۆ و سەحرا مێرگو مێرغوزار
بە ئەمری باری بوونە لالەزار
قەلبەزەی ئاوی چیای گەردنکەش
گرمو هۆڕیەتی دێتەخوار گەشگەش
داوێنی کێوو قەراخ ڕووباران
جێی حەسانەوەن لە بۆ دلداران
پنگەو کوڕادەو ڕێواسو مەندۆك
لەبنەی (زرۆێنە) خۆ دەدەن لە چۆك
قوڕاوی دەشتو چۆمو ڕووباران
دەرمانی دەردن بۆ دەردەداران
(ئاغا) وا قەندیل مەندیلی دڕی
کەو لە کەودەری جێ لانەی کڕی
لاوی خوێن گەرمی نیشتمانپەروەر
بەرگی زستانی فڕێ دا یەکسەر
بۆ نەورۆزانەو جەژنی سەری ساڵ
وەکو هەرلاوێك دەکەن ماڵەو ماڵ
بۆ سێزدەبەدەر هەر کیژو لاوێك
دەچنەدەر لە ماڵ ئەگەر بۆ تاوێك
ئەمنو تۆ ماوین وێڵو ئاوارە
جەژنەی بەڕاستین دیداری یارە

(ئـاغـا) لـە دووریـت یـەکجـار مـەحـزوونـم
چـۆن دامــرکـێـنــم کـڵـپــەی دەروونـــم
بـــەهـــاری شـــادیـــم لـــێ بـــۆتـــە خـــەزان
سـەد خـۆزگـەو بـریـا، دەرد نـاکـا دەرمـان
بـولـبـول لـە گـولشـەن شـیـوەنـیـەو گـریـن
بـۆ گـوڵ لـە جـۆشـەو بـۆدڵ دەکـا شـیـن
مـــنـــیـــش شـــیـــوەنـــم لـــە دووری یـــارە
لـێـم بـۆتـە دۆزەخ ئـەو چـەمـەنـزارە
ڕەشـەبـای گـەرمو گـەرمـای گـەرمـەسـێـر
گـولـی وجـوودت نـەخـەن بـەرەو ژێـر
بـــەهـــاری عـــومـــرم وەك پـــایـــز زەردە
نـەجـاتـم نـابـێ لـەو بـگـرەو بـەردە
لـەو شـاخو داخـە دڵ بـۆت بـەداخـە
یـادی تـۆ بـۆ مـن شـادیـی دەمـاخـە
کـوێـرایـیـم داهـات لـە دووریـی دۆسـتـان
پـێـم خـەزەڵـوەرە نـێـو بـاخو بـێـسـتـان
خـوایـە نـەورۆزمـان پـیـرۆزی نـوور کـەی
(ئـاغـا) و (فـاتـیـحـی) لـە بـەڵا دوور کـەی
**١٩٩٨/٤/٢ گردئاشەوان**

---

ئاغا عوسمانی وەجاخی:

خانە تەکانی: ماڵ وەدەرنان.

زڕوێنە هاوینە هەوارێکە کەوتۆتە نێوان گوندی ئاڵواتان و گوندی دۆڵەتوو لە دەشتی (وەزنێ)

( ٣ )

# بۆ مەلا سەید حسێنی قەووامی

(لە ئەسبابی فەرەح سالۆنی بەزمت پڕ تەدارەك بێ
شەوت هەر ڕۆژو ڕۆژت جەژنو جەژنت لێ موبارەك بێ)
شەوی حیجلەو زەفافت پڕ لە شادیو کەیفو خۆشی بێ
لەگش دەردو بەلا دووربی شەرابت عەیشو نۆشی بێ
لە گێژاوی زەمانەو گێژەلووکەی نەگبەتیو دووری
بەدووربێ قامەتی شەنگت، بژی دایم بە مەسرووری
فەلەك هێلانەیی بەختت، نەڕووخێنێ بە بای ئەستەم
وەکو قەندیل سەرت بەرزو وەکو کەودەر دلت مەحکەم
بەڕێزبێ جەژنەپیرۆزەی، عەرووسی نەوڕەسی کوردی
براگیان هەر ئەوەندەم هات لە دەستو، پێشکەشم کردی
لەسەر دوندی چیا وەك کەو، بخوێنێ بەختو ئیقبالت
بە ڕووسووری بەچەشنی گوڵ، وەسڵ کەی ماڵو منداڵت
حەدیقەو باخی جەننەت بۆیە خۆشن پڕ لە حۆرینە
لە دنیاش مالی بێ ژن چالە وەك زیندانە خزمینە
١٩٩٥/١١/١٩ گردئاشەوان

---

مەلا سەید حسێنی قەموامی: لەدایکبووی ساڵی ( ١٩٥٤ )ە لە گوندی ( بێ شاسپ ) ی سەر بەشارستانی سەدەشت لە دایکبووە. هاوڕێی نزیکی شاعیر بوو.

لەگش...کورتکراوەی لە گشتە.

* بەیتە شیعری ناو کەوانەکە، شیعرێکی بێخودی شاعیرە

## (٤)

# بولبول و گوڵ

(**بولبول**):

ئـەی گـوڵ، ئـەی خـونچـەی تـازە بـەهـارم
ئـەی سـوورە گـولـەکـەی چـۆمو ڕووبـارم
ئـەی هـێـزی دڵو ڕوونـاکـیـی چـاوم
تـاقـەتو تـیـنـی جـەرگـی سـووتـاوم
ئـەی بـووکـە سـوورەی بـاخـچـەی ژیـانـم
سـێـوە نـەخشـاوەی نـاو بـاخـەکـانـم
ئـەی دەوای دەردو زامـی دەروونـم
ئـەی گـولـی دەشـتو سـەحـراو هـامـوونـم
ئـەی ڕەوێـنـەیـی پـەژارەو خـەمـم
ئـەی وەنـەوشـەکـەی جـۆبـارو چـەمـم
بـۆچ وا ژاکـاوی ڕەنـگو ڕوو زەردی
پـایـزو زسـتـان هـەنـاسـە سـەردی
چـاو پـڕ لـە ئـاوو سـیـسو دامـاوی
بـێ بـەرگو گـەڵا دڵ هـەڵـقـرچـاوی
وەرە پـێـم بـڵـێ ئـەی گـوڵ لـەبـەرچـی
ئـەو بـۆنـە خـۆشـەت زوو لـەدەس دەچـی؟

پـێـم بـڵـێ ئـەتـۆش وەك مـن سـووتـاوی
وەك مـــن لـــەخـــەم دا جـــەرگ بـــڕاوی؟
وەك مـــن گـــیـــرۆدەی داوی گـــەردوونـــی؟
وەك مـــن بـــێـــکـــەس و مـــات و زەبـــوونـــی

❖❖❖❖

بـەگـۆنـای گـوڵ ڕەنـگ پـەرچـەمـی خـاوت
بـــە گـــوارەی لامـــل بـــە چـــاوت قـــەســـەم
بـــە بـــالای لاولاو ســـەروی خـــەرامـــان
بـــە ڕوومـــەتـــی وەك هـــەتـــاوت قـــەســـەم
بـەمـیـنـای گـەردن پـەنـجـەی خـەنـاوی
بـــەگـــیـــان و ڕوح و بـــە نـــاوت قـــەســـەم
بە لەیل بە مەجنوون، فەرهادی بێکەس
بـــە نـــالـــە و ســـۆزەی تـــاوتـــاوت قـــەســـەم
بـــەنـــامـــرادی مـــەم و خـــاتـــووزیـــن
بـــە مـــێـــرو وەفـــای ســـووتـــاوت قـــەســـەم
بـــە ڕۆژو بـــە شـــەو بـــە لـــەیـــل و نـــەهـــار
بـــە زولـــفـــی ڕەشـــی داوداوت قـــەســـەم

❖❖❖

شـــەو تـــا بـــەیـــانـــی دەکـــەم نـــالـــەنـــاڵ
ســـووتـــاوە جـــەرگ و دڵـــم وەك زووخـــاڵ
لـە دووریـت کـەوتـووم نـەخـۆش و بـێ حـاڵ
لـــە دەســـتـــم داوە ڕوح و ســـەرو مـــاڵ

تــا مــردن بــۆ تــۆ دەکــەم شــیــن‌و کــوڵ
هـەڵـبـەسـت‌و شـیـعـرم بـۆتـۆیـە ئـەی گـوڵ

(**گوڵ**):

ئـەی بـولـبـول یـاری خـەمـبـارو هـەژار
ئــەی دڵ بــرژاوی شــێــت‌و بــێ قــەرار
ئــەی بــێ مــرادی دیــداری دولــبــەر
بـولـبـولـی شـەیـداو وێـڵـی دەشـت‌و دەر
ئـەی خـۆش ئـاوازی نـاو بـاخ‌و گـولـزار
هــەتــاکــەی نــالــەو گــریــان‌و هــاوار
بــەهــارو پــایــز زســتــان‌و هــاویــن
بـەشـی تـۆ بـۆچـی بـۆتـە نـالـەو شـیـن؟
فـەلـەك مـن‌و تـۆی کـردووە ڕەنـجـەڕۆ
دای نــاوە بــۆمــان نــالــیــن‌و ڕۆڕۆ
بـالـی خـۆشـیـمـان فـەلـەك شـکـانـدی
هـەودای ئـومـێـدمـان فـەلـەك پسـانـدی
فـەلـەك زەردی کـرد گـۆنـای ئـالـی مـن
فـەلـەك تـێـکـیـدا خـەت‌و خـالـی مـن
شـەرتـە خـاڵ‌و خـەت جـوان بـکـەم بـۆ تـۆ
چـاوم ڕەش بـکـەم دەرکـەم لـك و پـۆ
وا بـەیـادی تـۆ گـەش بـوون لـك وپـۆم

شـــــەوو نـــــیـــــوەشـــــەو چـــــاوەڕوانـــــی تـــــۆم
ئـــــازیـــــزم تـــــاکـــــەی ئـــــازیـــــزم تـــــاکـــــەی؟
تـــوخـــوا لـــەیـــلـــەکـــەی بـــێ مـــەیـــلـــم تـــاکـــەی؟
بـــەســـیـــەتـــی جـــەورو جـــەفـــای زەمـــانـــە
بـــەس بـــە مـــن خـــۆشـــکـــە دۆســـتو بـــێـــگـــانـــە
مـــنـــیـــش هـــەر وەك تـــۆ هـــەنـــاســـە ســـەردم
هـــەروەك تـــۆ دایـــم گـــیـــرۆدەی دەردم
وەك بـــولـــبـــولو گـــوڵ (فـــاتـــیـــحـــی) و دولـــبـــەر
لـــەدووری یـــەکـــتـــر بـــوونـــە ســـەوداســـەر

**١٩٦٧/٣/٣ چەکۆ**

( ٥ )

# ئۆردوگای چوارقوڕنە

بـاران‌و سـەرمـای چـوارقـوڕنـەی بـیـتـوێـن
دیـکـتـاتـۆرانـە پـێـنـدەڵـێـن وەتـوێـن
لـەولاش قـوڕەنـووسـەك، بـاشـمـان نـادوێـنـێ
زۆر جـار پـێـلاومـان لـە پـێ دەڕفـێـنـێ
بـێ سـۆبـەو ئـاگـر بـێ سـووخـتـی زسـتـان
زریـان بـن گـورچـوون دەکـوتـێ بـە مسـتـان
وەعـدەو وەعـیـدی کـاك (قـائـیـد فـەیـلـەق)
پـێـمـوایـە ئـاخـری دەنـکـا ڕەق‌و تـەق
مـزگـێـنـی سـۆبـەو حـەسـیـرو زیـلـۆ
گـۆشـتـن کـەم دەکـا کـیـلـۆ بـە کـیـلـۆ
ژیـانـی نـێـو خـێـوەت بـێ عـەلائـەددیـن
نـەخـۆشـی هـەیـەو زیـان لـە بـۆ ژیـن
زۆریـان پـێـگـوتـیـن لـەمـبـەرو لـەوبـەر
لـەو نـاخـۆشـیـەتـان زوو دەبـەیـنـە دەر
بـەلام کـوا قسـەو پـەیـمـان‌و بـەڵـێـن
دەوای دەرد دەکـەن بـۆ پـێـمـان دەڵـێـن؟
چـوونـە لای دۆسـت‌و ئـاشـنـاو خـزم
مـەمـنـوعـە لـێـمـان بـۆیـە وا کـزم
ئـێـمـەش بـۆخـۆمـان زۆر بـێ سـەرو پـایـن

ڕەعیەتمان نییەو هەموومان ئاغاین
هەرکەس بەجۆرێ قسەی خۆی دەکا
دەیکەن بە بەزمو بە کێشەو هەرا
هێندێکی وان هەن، سمێڵ فش دەکەن
هەر ڕۆژەی بۆیەك خۆیان فش دەکەن
بەڵێ ڕەشەباش کرێوەی دێنێ
خێوەتان دەباو ڕستان دەپسێنێ
خۆ مام شەمالیش لەو دەورو بەرە
بۆ پیاوی هەژار هەر دەردی سەرە
گۆپاڵ بارانەی دێنێ بە دیاری
لێن دەبرێ ڕێگەو هاتوچۆی شاری
چەرچیو دەلاڵو دەسبڕی جاران
پارەیان نەهێشت بە دەست هەژاران
بە مریشكو هێلكەو سێو و پرتەقاڵ
پاك نەخۆش کەوتن پیرو کوڕوکاڵ
قوڕو چڵپاویش لێن بۆتە سەربار
لەدەس بێ ئاوییش کەوتووینە هاوار
زۆر ناڕەحەتم یەکجار خەمبارم
لە ژینی ئێرەم تەواو بێزارم

**١٩٨٠/٣/٤ ئۆردوگای چوارقوڕنە**

---

سالّی ١٩٨٠ کاتێك شەڕ لە نێوان بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی و کۆماری ئیسلامی ئێران هەڵگیرسا، فاتیحیش وێڕای هەزاران کەس بۆ جارێکی دیکە ئاوارەی کوردستانی باشوور دەبێ و لە ئۆردووگای چوارقوڕنە نیشتە جێ دەبێ.

( ٦ )

# شین بۆ قەلەکانی کاک ( سەید ڕەسوڵی ورچان )

شـــاعـــیـــر لـــەبـــابـــی مـــنـــت کـــەویَ
شـــیـــعـــری قـــەلانـــم لـــێـــت دەویَ
شـــیـــعـــرێـــکـــی دڵ بـــێـــنـــێـــتـــە کـــوڵ
بـــکـــا بـــە ئـــاو هـــەنـــاوو دڵ
بـــاســـی قـــەڵو ڕێـــوی و چـــەقـــەڵ
مـــاڵ نـــەخـــۆرانـــی دەم چـــەپـــەڵ
بـــاســـی دوکـــتـــۆرێـــکـــی وەك مـــن
ســـەیـــدێـــکـــی نـــەجـــیـــبو ورگـــن
بـــۆم بـــەیـــانـــکـــە زۆر بـــەجـــوانـــی
بـــەشـــیـــعـــری کـــوردیـــی ســـۆرانـــی

❖❖❖

بـــەســـەرچـــاو کـــاك ســـەیـــدی ورچـــان
ئـــەوەت شـــیـــعـــری قـــەڵو ڕێـــویـــان

❖❖❖

قـــەلـــیـــان خـــواردم ڕێـــوی‌و چـــەقـــەڵ
دوو قـــەلـــی وەك گـــامـــێـــش‌و کـــەڵ
دووســـاڵ بـــوو دەمـــکـــردن بـــەخـــێـــو
لـــەســـەر وان خـــواردم چـــەنـــد جـــنـــێـــو

نــەمــخــواردن، دەمــکــردن خــزمــەت
قــەل گــەورە بــن دەکــەن قــیــمــەت
بــۆ دەرمــاڵو تــوتــنو بــێــســتــان
جــیــرانــیــان لــەبــەردا وەســتــان
(پــیــرۆت) و (وەتــمــان) و (عــەولا)
(کــاك) و (مــام حــاجــی)ش مــاشــەڵــلا
بــاســی نــاکــرێ چــیــان پــێــکــردم
لــەســەر قــەل ئــابــڕوویــان بــردم
دەنــگــم نــەکــرد دەخــۆم قــەلان
لــەگــەڵ مــیــوانــان جــەل جــەلان
ئــەوەڵــی ســێــی حــەفــتــاو حــەوت
قــەلان قــڕانــیــان تــێــکــەوت
ڕێــویو چــەقــەڵ بــوون بــە دوژمــن
دوژمــنــی ســەیــدێــکــی وەك مــن
پــێــیــان وابــوو نــیــمــە کــەلــك
قــەت نــاکــەم خــزمــەتــی خــەلــك
هــەر نــەخــۆشــێ مــن بــیــچــمــە ســەر
چــاك دەبــێو نــایــمــێــنــێ خــەتــەر
کــەچــی ڕێــوی لــەگــەڵ چــەقــەڵ
ئــەمــڕۆ بــەمــن دەکــەن گــێــچــەڵ
هــەر لــە (شــێــنــێ) هــەتــا (ڕەزگــێ)

دەعبا نەما سەید نەیگێ؟
قەستەم بەخوای تۆلەی قەلەم
دەستێنم هەلکەوێ هەلم
هەر بەتاپڕی (خالەمەر) گیان
دەپڕژێنم کەلەلەی سەریان
کەولیان دەکەم دەیانفرۆشم
هەر بەوەی دێ فەرامۆشم
گۆشتەکەشیان لە بۆ خانم
بابیخوا قەزای لەگیانم
چونکە زۆری خزمەت کردن
هێندێکیان مان زۆریان مردن
دەچمە لای دۆستو هاوالان
دەلێم ڕێویان کردووم تالان
ڕاوکەر زۆرن بێنە فریام
(عەلیەستە) و (کوێخا عەولا)م
(حاجی خەیالێ) و (شێخ وسوو)
(ئەحمەدە سوور) و کاك( ڕەسوو)
(وەك (عەزیز) و کاك (مەلای شەل)
بگرن کونو یاڵو سەرکەل
بانگ کەم (حەمەو مچە کەلە)
بێن ڕاوە ڕێویو چەقەلە

(بــەردەڕەش) ئــەشــکــەوتــی (گــەلــێــڵ)
بــگـــرن لـــەمـــام ڕێـــوی بـــەفـــێـــڵ
(کــامــەســتــە) و (کــەنــەکــە ڕەشــە)
یـــــالـــــلا ڕاوی لــــێ دابــــەشــــە
هـــاتـــن خـــزم بـــە پـــاچو بـــێـــڵ
دەگـــەڕێـــن لـــە ڕێـــوی بـــەفـــێـــڵ
هـــەزارجـــاران لـــەمـــنـــو کـــەوێ
تـــۆڵـــەی قـــەلـــم لـــەنـــگـــۆ دەوێ
نـــەمـــانـــی ئـــەو جـــووتـــە قـــەلـــە
بـــۆ مـــن نـــیـــشـــانـــەی ئـــەجـــەلـــە
زۆریـــان پـــێـــگـــوتـــم بـــیـــانـــبـــەمـــە ژوور
دەنـــا ڕێـــوی دەیـــانـــکـــا ســـوور
ئـــامـــۆژگـــاریـــم نـــەگـــرتـــنـــە گـــوێـــم
گـــوتـــم ڕێـــوی چـــیـــەو ئـــەمـــن کـــێـــم
هـــەتـــا ئـــاوایـــان لـــێـــکـــردم
بـــەجـــارێـــك ئـــابـــڕوویـــان بـــردم
(ئـــەمـــیـــر) دەگـــری هـــەزار داســـتـــان
دەڵـــێ بـــابـــە قـــەلـــەکـــان کـــوان؟
دەڵـــێـــم ڕۆڵـــەم کـــوڕی ئـــەزیـــز
هـــاتـــن (مـــەلا خـــدر) و (عـــەزیـــز)
فـــەڕوفـــیـــکـــیـــان لـــە ئـــێـــمـــەی دا
قـــەلـــی چـــی مـــریشـــکـــیـــش نـــەمـــا
دڵـــم نـــەهـــات بـــیـــانـــدەمـــێ قـــەل
ڕێـــوی هـــات کـــردنـــی کـــەل و پـــەل

هــەر کــەس قــەلــی هــەبــێ و نــەیــخــوا
ئـــاخـــیـــری ڕێـــوی لـــیـــی دەبـــا؟
زۆرشـــوکـــرم کـــەمـــنـــیـــان نـــەخـــوارد
مـــنـــداڵ نـــەبـــوون هـــەنـــاســـە سـارد
ڕەفـــیـــقـــانـــم نـــەکـــەوتـــنـــە شـــیـــن
ڕۆلـــە قـــەڵو مـــریشـــك چ نـــیـــن
داخـــەکـــەم (ئـــەمـــەر) نـــەمـــاوە
زۆر لـــەمـــێـــژە لاقـــی شـــکـــاوە
دەنـــا تـــۆلـــەی بـــۆ دەســـتـــانـــدم
هـــەزار ڕێـــویـــی بـــۆ دەتـــڕانـــدم
ڕێـــویـــی نـــەدەهـــێـــشـــت لـــەونـــاوە
زۆری ڕێـــوی‌و چـــەقـــەڵ گـــاوە
**سونێ ١٩٧٧/٣/١**

---

**سەید ڕەسوڵی حەسەنزادە ناسراو بە سەید ڕەسوڵی ورچان. لە ساڵی ١٩٣٧ لە گوندی کەلبی ڕەزاخان لە دایك بووە. هاوڕێ و هاوبیری شاعیربووە و هەردوکیان بەهۆی کاری سیاسییەوە پەڕیوەی دیوی باشووری کوردستان بوون. ساڵی ٢٠١٦ لە وڵاتی ئەمریکا کۆچی دوایی کرد.**

**ناوی چەند راوچێیەکی ئەو دەڤەرەبوون.**

**حەمە کەڵەو مچەکەڵە ناوی چیرۆکیکی فۆلکلۆری کوردیە.**

**ناوی چەند جێگایەکی گوندی سوونێن.**

**ملاخدرو عەزیز..مامۆستا مەلاخدری دۆڵەگەرمی و مامۆستا عەزیز ئەحمەدی.**

**حاجی ئەمەری گۆڕەشێری هاوڕێ و هاوبیری فاتیحی و کاك سەید رەسوڵ بوو.**

( ٧ )

## سکاڵا

## ئەو پارچەشیعرەم وەکو سکاڵایەك لەدەستی بەحریٚ بۆ کاك ( مەلا ڕەسووڵی نەوزادی ) نوسیوە.

بــرام بــۆ دیــارنــی قــەولــت دابــوو بــێــی
چــونــکــە زۆر عــاشــقــی ســەیــرانــی بــەحــرێــی
لــەو ڕۆژانــەدا خــۆشــە ســەر بــەحــر
بــە گــونــدی ئــێــمــەی تــاڵ کــردوە شــەکــر
هــاڕەی شــەمــاڵ و (زاویــتــە) و زریــان
وەخــەڵــکــیــان خســتــوە هــاوارو گــریــان
تــەرزەو کــڕێــوەو شــڵــتــوشــۆ و بــاران
قــریــوەو قــیــژەی غــەواس بــۆ داران
(کــەڵــەك) وەك هــەڵــۆ لــەنــگــەر ڕادەگــرن
وەك مــاســیــخــۆرکــە هــەمــووشــت دەگــرن
ســنــدووقو تــەخــتــەو کــاریــتــەو بــەرمــیــل
کــیــســەخــەو بــن زیــن، بــتــڵو تــایــەی زیــل
هــەرخــوا دەزانــێ چــی دێــنــا لافــاو
لاشــەی بــەشــەرو بــێــشــکــەی تــێــکــشــکــاو
لــەلای (کــۆمــەڵــە) هــەر بــەســەیــارە

بـــار دەکـــراو دەبـــرا ئـــەو دارو بـــارە
بـەتـایـبـەت ئـەمـنـی بـێ خـانـەو لانـە
کـە هـیـچ جـێـگـام نـیـیـە لـەو دنـیـا پـانـە
ڕوو لـە کـوێ بـکـەیـن بـۆ کـوێـنـدەر بـڕۆیـن
خـوایـە بـە تـەمـای ڕوحـمـی زۆری تـۆیـن
دیسـان بـەحـر هـات کـەنـجـارەی دابـەر
دەشـتـایـی نـەهـێـشـت لـە(جـۆ)ش کـەوتـە سـەر
ئـەو کـەنـجـارەی وا خـاوەن دەرامـەت
وا ڕووی تـێـکـردوە شـوومـیو نـەهـامـەت
تـا هـات هـاتـمـان بـوو ئـەو دەشـتـی وا جـوان
خـەلـکـی بـۆی دەهـات بـۆ خـۆشـیو سـەیـران
سـەرچـاوەی کـانـیو قـۆپـیو جـۆگـەی ئـاو
لـە تـەمـاشـایـان تـێـر نـەدەبـوون چـاو
دیـمـەنـی واجـوان نـەخشـی خـودا بـوو
هـەرچـی دڵ حـەزکـا لـەو دەشـتـەیـدا بـوو
بـامـیـەو کـوولـەکـەو تـەمـاتـەو خـەیـار
نـەك لادێ بـەڵـکـو پـێـیـان تـێـر بـوون شـار
شـووتـیو دەلـووجـەو بـایـنـجـان، گـنـدۆر
لـەوانـی زۆر بـوون کـاك (عـەبـدوڵـلای سـۆر)
وەك (سـامـکـێ) وابـوون تـوتـنو گـولـەبـەڕۆژ
جـێـی گـۆنـگـەلان بـوون بـەشـەوو بـە ڕۆژ

بــــەلاوكو ســــێــگـــاو حــــیــــجـــازو قــــەتـــار
دلـــــی جـــۆش دەدان كـــاكـــی نــــیـــــوەكـــار
خـــالـــەی ڕێـــبـــوارو هـــەی نـــارێ نـــارێ
تـــۆ وەرە بـــنـــكـــۆڵ مـــن دێـــمـــە بـــژارێ
كـــیـــژو كـــوڕ بـــەجـــووت لـــە بـــژارو بـــنـــكـــۆڵ
یـــەكـــتـــریـــان دەدوانـــد بـــەچـــاوو مـــژۆڵ
هـــەتـــا دوازدەو نــــیـــو بـــەزمو هـــەرا بـــوو
بـــەن پـــێـــوەكـــردنو ســـەیـــرو ســـەفـــا بـــوو
ئـەو خـۆشـیـیـەن هـەمـوو لـێـگـەڕا بـەشـیـن
هـەر یـادی بـەخـێـر كـەیـفو پـێـكـەنـیـن
وەفـــای بـــۆ كـــەس نـــیـــیـــە دنـــیـــای بـــێـــوەفـــا
پـــیـــاوی،خـــۆت ســـاز كـــە بـــۆ ڕۆژی جـــەزا
مـــالـــو داهـــاتـــمـــان وا بـــەكـــارنـــایـــە
ڕێـــی نـــەجـــات بـــوونـــمـــان تـــەركـــی دنـــیـــایـــە

**١٩٨٨/٣/٥ كەنجاڕێ**

---

**كۆمەڵە :** داری كۆمەڵە. كەوتۆتە نێوان دەربەندی ڕانیەو گوندی كەنجاڕێ.

## ( ٨ )

# بەحری ساڵی ( ١٩٨٧ ) لە کەنجارێ

خــــزمـــان تـــرســـی زۆریـــان لـــێـــیـــە
تـــرســـەکـــەش تـــرســـی بـــەحـــرێـــیـــە
دەلـــێـــن ئـــەمســـالـــیـــش وەکـــو پـــار
بـــەحـــر دەنـــکـــا ڕەنـــج بـــەخـــەســـار
تـــووتـــنو بـــامـــیـــەو شـــووتـــیـــن نـــابـــێ
ئـــەگـــەر ئـــەو بـــەحـــرە هـــەر وابـــێ
وەك (کـــەرســـۆنـــان) نـــیـــنـــە پشـــتـــاو
ئـــاغـــا بـــۆمـــان بـــکـــا بـــەراو
هـــەمـــانـــە بـــەلام زۆر کـــەمـــە
ئـــەویـــش هـــەمـــووی دەردو خـــەمـــە
وەك تـــووتـــن هـــەلـــدەســـتـــێ کـــەلـــەی
بـــێ کـــەلـــە نـــابـــێ یـــەك پـــەلـــەی
دەلـــێـــن (حـــاجـــی ئـــەحـــمـــەد ســـالـــە)
پـــیـــاوێـــکـــی زۆر بـــەدفـــەســـالـــە
ئـــەمســـاڵ ئـــەو دەبـــێـــتـــە ئـــاغـــان
جـــەرگـــن دەکـــا داغـــان داغـــان
پـــرتـــەو بـــۆڵـــەو قـــیـــڕەو هـــەرای
هـــەر دەبـــێ بـــێـــیـــە تـــەمـــاشـــای

عەرزی پشت مالانی کێلا
جێگەی گاڕانی نەهێلا
زۆر لە مێژ بوو بەتەما بوو
بەتەمای ڕۆژێکی وابوو
بۆی هەلکەوت کاکم نۆرە
بۆن ساز دەکا تۆرەو سۆرە
چارمان نەما دەبێ بار کەین
خۆمان لەو بەحرە قوتار کەین
بۆ کوێ بچین، ڕوو کەینە کوێ
کوا وەکو ئێرەن بۆ دەلوێ
لێرە بێ قڕەو کێشەو هەراین
خودا تێکی نەدا ئاغاین
هەموو شتمان بەلێشاوە
کەم ماندووینو زۆر حەساوە
سڵقو توورو شێلمن زۆرن
تورتو سپیو سوورو بۆرن
خۆ ماشەڵلا بەحری ئەمساڵ
کەنجارەی وا پێکردین تاڵ
سەرماش لە ئەوەلی زستان
دەستی کردوە بەهەڕەشان
**کەنجاڕێ** ١٩٨٧/١٢/٢٨

( ٩ )

# گوندی کەنجاڕێ

گـونـدی کـەنـجـاڕێ لـە هـەشـتـاو حـەوت
جـێ تـووتـنـەکـانـی بـن بـەحـر کـەوت
ئـەو دەشـتـی واپـان کـە دەیـبـیـنـی تـۆ
بـەحـر دایـگـرتـوە هـەتـا لـێـوەجـۆ
زۆر کـەس بـەشـی خـۆی جـێ تـووتـنـی مـابـوو
(سـۆفـی عـەلـی) و مـن بـەشـمـان سـووتـابـوو
زۆرمـان هـاوار کـرد بـۆ جـێ تـەمـاتـە
کـەس بـەشـی نـەدایـن کـردیـانـە مـاتـە
ئـێـمـەش لـەداخـی قـەومـی بـێ عـەمـەل
یـەکـێـکـمـان سـاغو یـەکـێ نـیـوەشـەل
لـە بـۆ گـرێـوە خـەو دامـانـنـا قـەرار
یـانـە ئـەو بچـێ یـا مـن لـە بـۆ شـار
ئـاوان ڕابـوارد تـا گـەرمـا داهـات
لـە کـونـجـی خـانـوو خـۆمـان بـۆ کـرد مـات
بـەبـێ تـووتـنو بـامـیـەو بـایـنـجـان
چـاتـرە لـێـمـان کـاکـە (حـەمـەشـوان)
تـا (حـاجـی عـەلـی) فـەرمـانـڕەوا بـوو

ســــەدی وەکـــو مـــن بــــەشــی درا بـــوو
خـــوایــە ئـــەو حـــاجــیــە هــەرپــایــەدار بـــێ
بـــەخـــۆشـــی بـــژیو دوور لـــە ئـــازار بـــێ
دوو ســـاڵ لـــەســـەریـــەك جـــێ تـــووتـــنـــی دەدا
هـــەمـــوو شـــتـــم زۆر بـــوو دەژیـــام وەکـــو شـــا
بـــەڵام وا ئـــەمســـاڵ لـــەبـــەخـــتـــی نـــەمـــاو
دەگـــریـــم دەنـــالـــم لـــە چـــاو دێ قـــوڕاو
بـــۆ جـــێ تـــەمـــاتـــەو بـــامـــیـــەو گـــەســـكو مـــاش
کـــە ســـالان هـــەمـــبـــوون بـــەلـــێـــشـــاو بـــەلاش
دیـــارە هـــەر بـــەشـــەر یـــەك بـــەهـــەزارە
بـــۆ ســـپـــڵـــەو ســـەقـــیـــل شـــت بـــەخـــەســـارە
دەنـــا بـــۆ دەبـــێ لـــە دە پـــازدە مـــاڵ
هـــەر مـــەلا نـــەیـــبـــێ تـــەمـــاتـــەی دەرمـــاڵ
شـــوان و گـــاوان بـــی خـــۆشـــە بـــێ مـــنـــەتـــی
یـــان کـــرێـــکـــار بـــی ســـەر ڕووت پـــێـــپـــەتـــی
ئـــەو نـــانـــەی دەیـــخـــۆیـــن هـــەمـــووی حـــەرامـــە
نـــانـــی دەســـتـــی خـــۆت خـــۆشـــەو بـــەتـــامـــە
**کەنجاڕێ** ١٩٨٧ /٥/٥

---

سۆفی عەلی چیانەیی، ئەو ساڵە جیرانمان بوو.

## ( ١٠ )

# فەلەك

فەلەك وەرگەڕێ بەختو ئیقبالت
وەرگەڕێ دەوری حوسنو جەمالت
فەلەك هەی زالم هەی نا دادگەر
هەی چەرخی چەپگەرد بۆ شینو چەمەر
ئەوەی تۆ دەیکەی هەر لە تۆ جوانە
چۆنت هەلوەشاند ئەو کوردستانە
ئەو خەلکەت قڕ کرد بە سەرماو سۆڵە
ئێمە دەنگ ناکەین تۆ دەکەی بۆڵە
ئەو زالمەت کردە نەمرودی کوردان
وەك ئەو زالمەش ولاتی سووتان
هەر خۆت قازی بە ڕازی بەو کارەی
ڕازی بەو هەموو دەردو ئازارەی
ڕازی بەو هەموو کوشتو کوشتارە
بەو دەربەدەری و خەلکە ئاوارە
پێنج هەزار شارو گوندی تێك ڕووخاند
چەند ملیۆن کەسی دەشاخان خزاند
مالت خەرا بێت بۆ وات کرد لێمان
بۆ پێت چۆڵ کردین مەکانو جێمان
چەند هەزار مندالّ، پیرو پەککەوتە
لە جیاتی قەسر جێیان ئەشکەوتە
ئاوایە شێوەو کارو ڕەفتارت

ئاوایە بۆ کورد فەلەك ئاکارت
سەددامت کردە ئەژدیهاك بۆ کورد
دنیا دەزانێ چی بەو گەلەی کرد
ولاتی چۆلکرد لە شارو لە گوند
لەباتی مەلا، بانگدەر بۆتە کوند
غازی کیمیایی و بۆمبای سووتێنەر
نە هەلەبجەی هێشت نە مەرگەو پشدەر
(چەمی ڕەزان) و (دەشتی قەرەداخ)
نە سەرچاوەی ما و نە ڕەزو نە باخ
(شێخ وەسانان) و (دۆلی بالیسان)
بە ئاگری بۆمبای سەددام ئایسان
مەنتیقەی (شوان) و (دیبەگە) و (هەریر)
بە غازی خەردەل بوون بە زەمهەریر
دەشتی (شارەزوور)، پێنجوێن و کەلار
وەك بەهەشت وا بوون، بوون بێ ئاسەوار
(دۆلی جافەتی) و چوارتاو شارباژێڕ
(قەراج) کانگا بوو پڕ لە زێوو زێڕ
لای (خۆشناوەتی) و بناری (شارۆش)
قەندیل بەوانی دەهات فەرامۆش
ئەو کوردستانەی بەهەشتی زەوی
سەددام تێکی دا چ بلند چ نەوی
فەلەك نۆرەتە ڕوو لە سەددام کەی
ئەو تاجو تەختەی لەسەر حەرام کەی

**١٩٩١/٩/٦ گردئاشەوان**

## (١١)

# زستانی سالی(١٣٧٠)

بەناوی خودای بەرزو بێ هاوتا
سەلاتو سەلام لەسەر مستەفا
بڕێژی خوایە ڕەحمەتو غوفران
سەر ڕووحی پاکی پێشەوای ئینسان
بۆ سەر مەزاری خولەفای ئەنوەر
بوبەکرو عومەر عوسمانو حەیدەر
جگەرگۆشەکەم (هێمن) ی دلبەندم
ڕووحی ڕەوانم هەنگوینو قەندم
وا بۆ یادگاریو بۆ بیرەوەری
زۆر بەڕەوانیو بە موختەسەری
دەنووسم باسو بەسەرهاتی ساڵ
سالی سێسەدو حەفتای ترشو تاڵ
باسی زستانی تووشو پڕ نەگبەت
زستانی سەختی پڕ ئێشو ئەزیەت
ئاوایە کاری خودای میهرەبان
هەژدەی لە پایز دایە بەر زستان
زستانی ئاوای پڕ سەرماو سۆڵە
هیچ کەس نەیدیوە لەو دەشتو دۆڵە
دنیا سەراسەر سپیە وەك مەندیل

گـەرمـێـن‌و کـوێسـتـان بـەفـر کـردی دیـل
(سوونـە) و (مـارەدووە) (ڕەزگـە) و (شـارۆشـان)
(ئاشقولکە) و (ورتـە)، (کـاسـکـان) (پشت ئـاشـان)
(بـالـەکـی) و (خـۆشـنـاو) (دۆلـی جـافـەتـی)
قـەت نـەیـانـدیـوە وا نـەهـامـەتـی
سێ مـیـتـر زیـاتـر بـاریـوە لـێـیـان
بـن بـەفـر کـەوتـوون چـەنـد شـارو دێـیـان
بـێ سـووتـەمـەنـی‌و ئـازووقـەی زسـتـان
لـێـیـان خـەرا بـوو ولاتـی وێـران
مـەرگـەو بـیـتـوێـن و پشـدەرو ئـاکـۆ
بـەفـر کـردوونـی خـەسـتـەو ڕەنـجـەڕۆ
دەشـتـی شـارەزوور، سـەی سـادق، کـەلار
چـەمچـەمـاڵ، بـازیـان، سـووسـێ، سـەرچـنـار
ڕوانـدز، دیـانـا، چـۆمـان، گـەلاڵـە
هـەڵـگـورد وەك سـەددام لـەسـەریـان زاڵـە
ڕەشـەبـاو شـەمـاڵ دوو دوژمـنـی کـورد
چـی لـە دەسـتـیـان هـات وایـان بـە کـورد کـرد
چـەنـد هـەزار مـاڵ‌و گـونـدی کـوردسـتـان
بـوونـە خـۆراکـی عـەزیـای زمـسـتـان
هـیـچ جـێـیـەك نـەمـا بـەفـر نـەیـکـا پـڕ
چـەنـد دێ و مـەڕو مـاڵ بـەفـر کـردی قـڕ
ئـۆردووگـای (لاوێـن) بـێ نـەوت‌و گـازن

بەو سەرماو سۆڵە یەکجار بێوازن
یەك بەرمیل گازۆڵ بۆتە سێ هەزار
بۆ پیاوی هەژار هاوار سەد هاوار
شەماڵ چەند هەفتە بێ پشوو هەردێ
ڕێی ماشێن نەما لە شارو لە دێ
بەفرو بەستەلەك ڕەشەباو شەماڵ
ئاوارەی کوردیان خستە زاڵەزاڵ
جێگەوبان نەما لە گشت کوردستان
کە بەفر نەیکا بە حەبس‌و زیندان
ڕێوبان گیران‌و نەخۆشی‌و مردن
مەڕو ماڵاتیان پاك لەناوبردن
هەر لە تۆ جوانە کاری بێ نوقسان
دەکەی بە دۆزەخ لە ئینسان زستان
خوایە ئیمانم بەخوایەتیت هەس
هەر تۆ ڕەحیمی‌و هەر تۆی فریادڕەس
بڵندو نەوی‌و دەشت‌و خڕو دۆڵ
کەسی تێناچێ لەبەر بەفرو سۆڵ
لە دەشتی (وەزنێ) و لای سەردەشت بەفر
لەزۆر شوێن دەڵێن بۆتە سێ مەتر
(ئالان) و (بانە) و (کەلوێ) و (کەلی خان)
(گۆڕمووسا) و (لەند) و (جانداران)، (مەیدان)
قەندیل و (شەڕگە) و (خوار) و (سپی سەنگ)

یــەکســەر پــۆشــیــان بــەرگــی ســپــی ڕەنــگ
شــاخــی بــەســامــی (تــەرەغــەی مــوکــری)
لــەبــەر شــیــددەتــی ســەرمــای زۆر دەگــری
(گـرد مـەنـدیـل) سـپـیـیـە عـەیـنـی مـەنـدیـلـە
وەك هـێـلـکـەی خـڕەو هـاوتـای قـەنـدیـلـە
هــەرەســی بــەفــر زۆر جــێــی تــێــکــداوە
زۆر مـــاڵو گـــونـــدی وەبـــەر خـــۆی داوە
دالــدەی نــەهــێــشــتــوە بــۆ دەعــبــای کــێــوی
گــورگو چــەقــەڵو کــەروێشــكو ڕێــوی
قـــازو مـــراوی و قـــەلو کـــەو و داڵ
قــڕانــیــان بــۆ هــات بــە بــەفــری ئــەمســاڵ
شـــالـــورو بـــازو شـــمـــقـــارو شـــەهـــێـــن
سـەر نـاهـێـنـنـەدەر بـۆ (بـەحـری خـوێـلـێـن)
حــاجــیــلــەو دالاش چــلــووبــریــان کــرد
لـە دەشـتـی بـیـتـوێـن هـەمـوو قـڕیـان کـرد
چـۆلـەکـەو کـۆتـر، قـاژوو سـیو قـوریـنـگ
چــوڕە و ڕیشــۆلــەو قشــقــەلــەی زریــنــگ
ســـامـــانـــی بـــەفـــر کـــۆلانو حـــەســـار
بــلــیــنــدە هــێــنــدەی بــالای ســپــی دار
مـــەیـــدانـــی حـــەشـــرەو ڕۆژی واوەیـــلا
ئـــای لـــەو زســـتـــانـــەی هـــەزار مـــاشـــەلـــلا
خــەلــکــی لــێــڕەوار گــەرمــە ســۆبــەیــان
چــاو لــە نــەوتو گــاز نــایــە نــۆبــەیــان

هەر بۆیە مردووی لای لێڕەوارم
بەدڵ لە سیاکێو قەلسو بێزارم
دلمان زۆر خۆش بوو گوتمان ڕەشەمە
نەجاتمان دەبێ لەو دەردو خەمە
کەچی لە مانگی ڕەشەمەی پیرۆز
خۆشی ژیانمان گشت لێبوو هالۆز
کردیە کڕێوەو شلێوەو باران
لافاو پڕی کرد سەر جادەو کۆڵان
شۆفڵو بندۆزەر، لۆدێر، گرێدەر
بەحاڵ لە بەفرو ئاو دەهاتنە دەر
ژێرخانو متبەخ بوونە گۆمی ئاو
ماڵ نییە نەیبێ هۆدێکی ڕووخاو
تەویلەو ئاغەڵ تەندوورو کادێن
بەبیری هیچ کەس نەبوە وا وەزێن
دلۆپەش بوونە سەرباری دەردان
بوونە قوڕەشێلە بەر دەرکو سەربان
دێ دەلێی کەشتیەو لەسەر بەحرێیە
هەرکەسەی ترسی ماڵی خۆی لێیە
شەوی (دەی دوازدە) (چلەتڕێن بوو)
شکستو بەستو زستان تەزێن بوو
ئەوەی ڕەشەمە کردی بە خەلك
زستان وای کردبا نەن دەما کەلك
دلمان زۆر خۆش بوو ئەوە هات بەهار
لەدەس سەرماوسۆڵ دەمانبێ قوتار

بــەلام ســەد خــۆزگــەن بــە چــلــەو ڕێــبــەنــدان
ئــای چــی پــێــکــردیــن دوا مــانــگــی زســتــان
هــەر نــوای دەبــارێ دلــمــان دەکــا تــەنــگ
گــرچــووی پــیــاو دەبــڕێ وەك تــۆپو تــفــەنــگ
ســێ شــەو ڕەشــەمــە تــڕانــدی چــلــە
هــەم چــلــەی گچــکــەو هــەم چــلــەی زلــە
خــوایــە بــەڕەحــمــەت خــەلاس بــێ زســتــان
بــە بــەهــار شــاد بــیــن دەرچــیــن لــە زیــنــدان
بــەهــارمــان خــۆشو کــوێــســتــان زەنــوێــر بــێ
جــەژنــی نــەورۆزمــان پــڕ خــێــروبــێــر بــێ
لافــاوی نــەگــبــەت دووربــێ لــە ولاتــمــان
ســەربــەرزو شــادبــن شــارو دێــهــاتــمــان
هــەر تــۆی پــەنــادەر، کــارســازی کــارمــان
خــۆش بــی لــە گــونــاه و هــەلــەی ڕەفــتــارمــان
هــەر تــۆی بــەخشــنــدەو ســەخــیو غــەفــوری
هــەر تــۆی خــەتــاپــۆش، لــێــمــان بــبــووری
(فــاتــیــحــی) دەڕۆن ڕۆژی تــرشو تــاڵ
شــاری خــامــۆشــان بــۆت دەبــێــتــە مــاڵ
۱۹۹۲/۳/۵ گردئاشەوان

---

زستانی ساڵی ۱۳۷۰ی هەتاوی دەکاتە زستانی ساڵی ۱۹۹۱- ۱۹۹۲ی زاینی.

وەزێن: بزێنەوە، ئاویان لێ هەڵقوڵێ

شەوی دەی دوانزە بەرامبەرە بە ۱۹۲۲/۳/۱

## (١٢)

# سێبەر کوژ

وەکو کەلی گرتك سپیان، دووکەڵ لەکوێ هەستێ لەوێم
بە ڕۆژ جێ نامێنێ نەچم، میوانی مالی خۆم شەوێم
ناو گوند چۆڵ و هۆلەو خالی، نە پیاو دیارەو نەمندالی
جارجار کەلەشێر دەخوێنێ، بۆپەیداکردنی هاوالی
دێیەکە بێ هەراو قرە، نە شەڕەو نە چەقەو گوڕە
مەلەغانەو گەنم دروون، زۆر لە کاردایە (ترِتڕە)
دەسکەنەی نۆك گالەیەتی، دۆستی کابرای پالەیەتی
ئافرەت لەو بەر سوورەتاوە، لەتاو کۆرپەی زالەیەتی
مەلاش وەك تەمبەلی بەغدا، خۆی بەو دیوەو دیودا دەدا
چاوی دایم لە سەعاتە، هەر وەختی هات بانگێ دەدا
مەلا ئاوایە ئەحوالی، بەخۆو بە ماڵو مندالی
بوونە تەمبەلی زەمانە، کەس نایانداتێ حەمبالی
چاو لەدەستی ئەمو ئەوین، بە ڕۆژو بە شەو دەخەوین
مەرد ئەو کەسانەن کار دەکەن، تا بەهێزو توندو قەوین
سێبەرکوژە پیاوی مەلا، پالەوانە کاکەی فەلا
خۆزگە مەلا بامەو فەلاح، مەلایەتیم وەلادەنا
فەرموویەتی خەیرولبەشەر، فێربن عیلم لەگەڵ هونەر
خۆشەویستی خوایە سەخی، سەقیل جێگەیەتی سەقەر
لە دنیادا پیاوی سەخی، دنیاو بەهەشتی کرد کەوی
سەقیلی پیسی نان نەخۆر، بەدلخۆش هەرگیز ناخەوی

دەڵێن پیر گوڵی ئاواییـن، گوڵی شینو شادیو شاییـن
کۆڵەکەی مزگەوت و مەلان، بانگدەرن مەردی خوداییـن
چبکەم بۆ دوو پیری بەبیر، پیری زاناو هوشیارو ژیر
لەسەر تاتو حەوزو کانی دانیشتبایـن وەك شاو وەزیر
نە بانگدەرەو نە پیری ژیر، نە دەولەمەندەو نە فەقیر
پەپوو لەناو گوند دەخوێنێ، سۆفیو دەروێش بوونە حەسیر
بەرقیش وەکو ئاشی بەردێ، لە دە ڕۆژان ڕۆژێك دەبێ
تاریکە شەو ئەنگوستەچاو، ڕۆژی دزیە گەر پیاو هەبێ
مێشە ڕەشەو تەپۆ کوێرە، خول دەخۆن عەینی گاگێرە
لەدێهات هەرچی دەیبینی، چاوپرووشە یانە کوێرە
زۆرمان پووڵ دا تاهات بەرق، بۆمان کڕی زەرقو بەرق
گوند هەر تاریكو بێ شۆقە، (جاو البرق، ماکو فرق)
(سیم بان) پسا لە ڕێگەدا، خۆی بە دارو بەرددا دەدا
تا پیرانشار بێ ڕاوەستان، دەژمێرێ دارتەلی ڕێگا
خوایە دەوایەك بۆ دەردم، کزو نەخۆشو ڕەنگ زەردم
ڕازیم بەو بەشەی پێت داوم، تا لەسەر دنیاو سەر هەردم
هەرچی زوبان دەیڵێ درۆیە، شاعیر درۆی پیشەی خۆیە
نا ئومێد نیم لە ڕەحمەتت، لێخۆشبوون لایەقی تۆیە
ئەی (فاتیحی) دەبڵێ خودا (فَاجْعَل رِیاضاً قَبْرُنا)
(فَاغْفِر لَنا یا رَبَّنا)، بۆگشت کەسێ هەرتۆی پەنا

١٩٩٧/٧/٢٥ گردئاشەوان

# نامەی شیعریی

## (١)

## نامەیەك بۆ كاك ( حەمە پۆڵا )

كاكە حەمەی گوندی (شۆڕان)
تاقە ڕاوكەری دوای پۆڕان
هێندە گریاوم لە دووریت
فرمێسكی چاوام هەلچۆڕان

❖❖❖

دەمێكە بێ خەبەرم لێت
دەزانم كە زۆر خۆشە جێت
وەك بەهەشتە جێو مەكانت
بۆلای شاری زۆر قورسە ڕێت

❖❖❖

(عەلی) و (مامز) و مندالەكان
شەوێك هاتنە گردئاشەوان
زۆر خۆشمان ڕابوارد ئەو شەوە
بەجێ مابوو (حسێن) ی شوان

دەڵێن بەکۆڵ دێنی داران
ورگت نەماوە وەك جاران
دنیاکە زۆر بێ وەفایە
تەماشای چۆن دەکا کاران

❖❖❖

هەرچی سواربوون ئێستا پیادەن
پیادەش سواری تاکسیو جادەن
شەلاتیو سەر چەوریش هەموو
مەستی ویسکیو بیرەو بادەن

❖❖❖

ئەو عالەمە چۆن سووڕاوە
کێ لەسەر جێی پاری ماوە؟
سەردار گاوان، شوان سەرداره
سەد بێوەمێرد بێ ژن ماوە

❖❖❖

کیژی شۆخی کوردەواری
ئەوەی جوانیی لێ دەباری
ئێستا خەمبارەو حاڵ پەشێو
بزەی لە لێو نابێ جاری

❖❖❖

(بەکره) ی خوارزاو (حەمە) ی زاوات
مامۆستا (بلە) و (سوورەی ئاغا) ت
(حاجی حەسەن) (عەزەو عوسمان)
بۆ دیداریان دەخۆم ئاوات

مامۆستات بزنەکەی ماوە؟
ئەستێورە یانەخۆ زاوە؟
دەستت خۆش بێ شیعرت نووسی
سەودای وا هەرگیز نەکراوە

❖❖❖

مندالی تێر لە ماستو دۆن
پەنیرو شیرێژ، لۆرکو ڕۆن
بەرەکەتی شامیان هەیە
چەند ماڵو گەڕەك لێی دەخۆن

❖❖❖

جارو بارەش دیاریو سەوقات
بۆ (عەلی سێوەیسی) دەبات
جێگەی قشلاخەو خۆش لەوەڕ
ئەی پیاوەتی خۆ نەبووە قات!!

❖❖❖

لە (بێشەوز) و (پیرەخەروا) ش
بزن دەلەوەڕێ بەلاش
لە (ڕەزۆکە) و (قەلاتەسەن)
ڕێگەی گرتووە پووشو پەلاش

❖❖❖

کانیو مزگەوتەکەو ماون؟
خەرا نەبوون نە ڕووخاون؟
کێ بانگدەرەو کێ پێشنوێژە
(کۆلنەدەر) و نەهێناون؟

(حـــاجـــی مـــەلا) ی (شـــێـــخ ئـــاودەلان)
نـــایـــەتـــە خـــواریٚ جـــەل جـــەلان
(حـــەمـــە) و (حـــوســـێـــن)ی بـــرای چـــۆنـــن
دەبـــڕن ڕیشـــی نـــێـــریـــەگـــەلان؟

❖❖❖

(ڕەســـووی مـــام ســـمـــایـــل) و (عـــەولا شـــەل)
(مـــیـــنـــە) و (وســـوو) گشـــت قـــەوم و گـــەل
( مـــەلاحســـێـــن کـــوڕ حـــاجـــیـــە ڕەش)
ســـڵاویـــان لـــێـــبـــیٚ تـــێـــرو تـــەســـەل

❖❖❖

(ئـــاوارە) یـــەو (عـــەزە) و (حـــیـــنـــە)
(مـــرۆت) (کـــەژاڵ) و (نـــاســـك) یـــنـــە
(هـــیـــوا) و (گـــولالـــە) و هـــاوســـێـــکـــان
ســـڵاو بـــۆ وان چـــیـــن بـــە چـــیـــنـــە

❖❖❖

(حـــەمـــە خـــۆشـــنـــاو) ت بـــیٚ ژنـــە
وەك تـــۆ ئـــارەزووی هـــەر کـــونـــە؟
ئـــەو دەورو بـــەرەی پـــاك گـــەڕا
جـــەرگو هـــەنـــاوی کـــونـــکـــونـــە

❖❖❖

(خـــالـــیـــد) و (کـــاوە) ش کـــوڕی تـــۆن
نـــەکـــەی ڕوویـــان لـــێـــبـــکـــەی مـــۆن
ئـــەتـــۆ ســـەوز، ئـــەوان ســـوورن
ســـەوزو ســـوور یـــەکـــتـــر چـــاك دەخـــۆن؟

بــــۆ چـــاو زەقو بـــابـــی گـــەورە؟
هـــەرچــــی هـــەن لـــەو دۆڵو دەورە
یـــەك بـــەیـــەك سـلاویـــان لـــێـدەكـــەم
خـــوایـــە ڕامـــالـــی ئـــەو هـــەورە

❖❖❖

ئـەو سـاڵ هـەت بـوون بـامـیـەو شـووتـی
دەنـــگـــت دەهـــات وەكـــو تـــووتـــی
تـــــرۆزیو خـــــەیـــارو گـــنـــــدۆرە
بـەچـەنـدی بـوون حـەمـەد، پـووتـی؟

❖❖❖

وەكـــیـــل بـــە بـــۆ دوعـــاو ســـەلام
(فـــاتـــیـــحـــی) دەڵـــێ خـــاسو عـــام
بـــۆخـــزمـــی (داودیـــە) و (ئـــالان)
لـــە شـــێـــخ فـــەرخـــیـــش دەكـــەم ســـەلام

**گردئاشەوان ١٩٩٢/١٢/٢٢**

---

شاعیری میللی حەمە ڕەسووڵ عەبدوڵلا، ناسراو بە (حەمە پۆلا) لە ساڵی ١٩٣٥ لە گوندی شۆڕان لە دایكبووە. یەكێك لە هاوڕێ و هابیرەكانی فاتیحی بوو. ئێستا لە شاری قەلادیزێ دادەنشێ. دیوانە شیعرێكی هەیە ئامادەیە بۆ چاپ.

ناوی چەند موچەو مەزرایەكی گوندی شۆڕانن.

( ٢ )

# زۆرم پێخۆشە بێمە لات

## نامەیەك بۆ ( عوسمانی وەجاخی )

سـلاو ئـاغـای وەجـاخـزادە
ئـاغـای شـاعـیـر، نـەجـیـبـزادە
سـلاو پـڕ بـە دەشـتـی (وەزنـێ)
پـڕ بـەو دەشـتـەی دڵ پـێـی شـادە

❖❖❖

دەمـێـکـە لـێـت بـێ خـەبـەرم
دێـمـە لات لـەسـەر سـەفـەرم
زۆر نـاخـۆشـە بـێ تـۆ ژیـان
بـەبـێ تـۆ چـۆنـی دەربـەرم

❖❖❖

نـامـەکـەی تـۆی هـێـنـا تـەتـەر
نـەك تـەتـەر بـەڵـکـو شـیـنـەکـەر؟
بـەهـەزار حـاڵ خـوێـنـدرایـەوە
تـەڕ بـبـوو، شـۆرابـوو یـەکـسـەر

❖❖❖

زۆرم پـێـخـۆشـە بـێـمـە لات
بـێـمـە لای دۆسـتـی دوور ولات
بـۆ یـەك وەگـێـڕیـن دەنـگو بـاس
چـمـان دیو چـیـمـان بـەسـەر هـات

برام ئێرەش ناخۆش نییە
هیچی لەوێ کەمتر نییە
قاسمەڕەش شاری تازەیە
لەگەڵ شاران فەرقی نییە

❖❖❖

سێو و پرتەقالی زۆرە
کاناداو ساردیش بەو جۆرە
باسی کەبابت بۆ ناکەم
چاکترین چەشنی پێخۆرە

❖❖❖

دۆستو برادەریش زۆرن
هەمەڕەنگ و هەمە جۆرن
گومرگ چیو قازیو مەلان
سپیو ڕەشو شینو بۆرن

❖❖❖

هاودەمە (ڕەحمانی شەخسەی)
هەر دەبێ گوێی لەبۆ هەلخەی
(کوێخا برایمیش) زۆر ئاشنایە
گوێ ناداتە (عەولا پەلخەی)؟

❖❖❖

(حاجی حەسەن) ت وەلداشە
(عەلییش) هاودەمێکی باشە
کاک (عەزیز) و (مەلا ڕەحمان)
کاریان پێوانی قوماشە

بەهار دابێ دەچمە کوێستان
دەچمە (زرڕوێنە) بۆ سەیران
چای لێدەنێم لە (باخۆلی)
لە بۆی دەڵێم شێعرو بەستان

❖❖❖

دەخۆم کەنگرو کارگو ڕێواس
بێبەشن ئەتۆو کاك (هەباس)
(حەسەن ئاغا) و (حاجی و عەزیز)
بۆیان دەنێرم مام ڕێواس

❖❖❖

بۆت دەنێرم پنگەو لووشە
پنگەی گەرمێن وەکو پووشە
دۆکلیو زۆر خۆشە بەهاران
گەرمێن زۆر گەرمو چەمووشە

❖❖❖

لەگەڵ شنەو سۆزەی شەماڵ
بۆ کوێستان دەچن کوڕوکاڵ
کیژو کوڕ دەگرن ڕەشبەڵەك
لەسەر ئاوی وەك زیوی قاڵ

❖❖❖

کوێستان هەر ساردو سەرمایە
بەلای گەرمێن ڕەشەبایە
دارم زۆرەو سۆبە گەرم
مزلم وەك قۆناغی شایە

(ئـــاغـــا) گـــیـــان کـــاك (حـــەمـــە پـــۆلا)
ئـــــەو شـــــاعـــــیـــــرەی وا نـــــاقـــــۆلا
ســــــلاوی گــــــەرمـــــی لــــــێــــــدەکــــــەم
هــــێــــنــــدەی درۆی (ڕەســـــوو جـــــۆلا)؟

❖❖❖

ئـــیـــتـــر مـــن بـــەخـــوات دەســـپـــێـــرم
چـــــاوەڕێـــــی دووعـــــای بـــــەخـــــێـــــرم
هـــەر ئـــــەو زســـــتـــــانــــە تـــەواو بـــێ
بـــــۆلای تـــــۆ خـــــۆم هـــــەڵـــــدەدێـــــرم

١٩٨٣/٢/٨ داوداوە

( ٣ )

## نامەیەك بۆ كاك حەمە پۆلا

ئـــەمـــڕۆ كـــە دیـــم ســـمـــایـــلـــەجـــۆڵ
دلـــم بـــۆت كـــەوتـــەجـــۆلـــەجـــۆڵ
وتـــی دیـــارە بـــێـــخـــەبـــەری
لـــەو پـــەلـــوولـــەی واچـــەورو چـــۆڵ
فـــكـــری بـــلاو كـــردم تـــەواو
بـــەپـــرتـــەپـــرتو بـــۆلـــە بـــۆڵ
كـــاكـــە حـــەمـــەی دۆســـتـــی قـــەدیـــم
كـــەوتـــۆتـــە لای (ئـــەمـــەر كـــاكـــۆڵ)
جـــارو بـــار بـــپـــرســـە حـــالـــی
لـــە (حـــوســـێـــن) و (عـــەلـــی) شـــڕۆڵ
لـــە (ئـــاوارە) (نـــازدار) (مـــرۆت)
لـــە بـــووك (هـــەمـــیـــن) ی تـــونـــدو تـــۆڵ
چـــۆنـــە (شـــۆڕان) لـــە گـــەڵ (زێـــوكـــە)
لـــە (مـــام مـــەلا) و (عـــەولا بـــابـــۆڵ)
جـــیـــرانـــەتـــیـــی كـــامـــیـــان خـــۆشـــە
(حـــاجـــیـــە رەش) یـــا (خـــەلـــیـــلـــی) زۆڵ
لـــەدڵ دەراوێ فـــكـــری قـــۆڕ
مـــاچـــكـــردنـــی نـــازی نـــەرمـــونـــۆڵ
ســـەرخـــۆشـــكـــە لـــە تـــوتـــن و گـــەنـــم
لـــە ڕەزۆكـــەی قشـــلاخ و چـــۆڵ

نانیٚ وەدەست بێنە برام
لە دوور خۆشە دەنگی دەهۆڵ
بۆخزمەتی ولاتەکەت
وەك پالە هەلبمالە قۆڵ
یاخوا بژی بیٚ دەردو خەم
هەر شاد بی پڕ بە دەشتو دۆڵ
سەربەرزیی تۆ خۆشی منە
دووریت لە هاودەمی کلۆڵ
دوژمنی حیزی خۆنەگر
لە کوردستان کراوە مۆڵ
ئێمەش دەبیٚ لێی ڕاپەڕین
شەلو کوێریان بکەینو کوڵ
کوردستان بەهەشتی کوردە
ئاوی کەوسەر، ئاوی (باخۆڵ)
ڕاستە بەهەشت زۆر دلگرە
شێوێکە لە هەوار (بابۆڵ)
چاوەڕوانی ڕۆژێکی وام
وەك مەڕ دوژمن داکەینە هۆڵ
ئەودەم بابمرم بیٚ ئەجەل
وەك تاوی هاوینو سەهۆڵ
(فاتیحی) ژینی بۆچییە؟
لێفەی ئاسمانەو فەرشی خۆڵ
**١٩٧١/٤/٨ دێلۆ**

( ٤ )

# نامەیەك بۆ مامۆستا ( غەریب پشدەری )

بـــرای بـــەڕێـــزم مـــامـــۆســـتـــا غـــەریـــب
خـۆشـەویـسـتـی گـەل، نـەجـیـبـی لـەبـیـب
دیـــاریـــی جـــەنـــابـــت گـــەیشـــتـــە دەســـتـــم
هـــەر بـــژی، شـــاد بـــی، غـــەریـــبـــی ئـــەدیـــب

دڵ گـــەشـــایـــەوە کـــە گـــەیـــیـــە دەســـتـــم
ئـێـسـتـاش بـەبـۆنـی ئـەو دیـاریـیـە مـەسـتـم
دیـــاریـــی نـــووســـەرو شـــاعـــیـــران شـــیـــعـــرە
بـۆیـە بـۆم ناردی مـنـیـش هـەڵـبـەسـتـم

کـــتـــێـــبـــی (ئـــولـــدووز) بـــەزمـــانـــی کـــوردی
مـــوتـــالـــەعـــەم کـــرد، جـــوانو بـــەوردی
زۆر لـــە ئـــەســـڵـــەکـــەی بـــەتـــامو خـــوێـــتـــر
هـــەربـــژی نـــووســـەر بـــۆ دەســـتو بـــردی

یـــاخـــوا هـــەرخـــۆشـــبـــی غـــەریـــب پشـــدەری
شـــادبـــی و بـــە دووربـــی لـــە کـــوێـــرەوەری
هـــەر لـــەخـــۆت جـــوانـــە وتـــاری شـــیـــریـــن
شـــیـــعـــرو پـــەخشـــانـــی دوڕو گـــەوهـــەری

چی بکەین زەمانـە نـاجـوورو چـەوتـە
خۆشیو تالیەکەی هەر بە هەڵـکـەوتـە
زۆر گـەوجو نـەزان مـەردی زەمـانـەن
زاناو فەیلەسوف جێـیـان ئـەشـکـەوتـە

ئـەو نـووسـەرانـەی کـە مـووقـەڵـێـشـن
هـەر دڵ بـەداخو حـەسـرەتو ئـێـشـن
هەر چەندە زانین بەرەوپـێـش دەچـێ
زانـایـانـی کـورد زۆرکـەم لـەپـێـشـن

دەنا چۆن دەبێ لەچـەرخـی بـیـسـتـەم
هەر لەسەر کورد بێ زۆرداریو سـتـەم
میللەتان هەموو بە مافیـان شـاد بـوون
بـەشـی بـرای تـۆش تـالـیـیـەو ئـەلـەم

جـاران دەیـانـگـوت تـرسـنـۆك جـووە
لـەسـێـبـەری خـۆی زنـدەقـی چـووە
بـەڵام ئـێـسـتـاکـە زەمـان گـۆڕاوە
غـیـرەتـی ئـێـمـە بـەر جـوو کـەوتـووە

ئـــەوە ڕۆژگـــارە کـــاری وا دەکـــات
دەسـڕەنـجـی هـەژار زۆردارە دەیـبـات
ئەو ڕۆژە هـەردێ گـەلـمـان هـاوار کـات
فـەقـیـر نـۆرەتـە زۆردار چـی لـێـهـات

**کەنجارێ** ١٤/٩/١٩٨٥

ئوڵدووزو بوکەشووشەی قسەکەر. ناوی کتێبێکی سەمەدی بێهرەنگییە مامۆستا غەریب پشدەری کردوویەتییە کوردی.

( ٥ )

## نامەیەك بۆ كاك ( نەسرەدین- دكتۆر سۆرانی )

بەناوی خودای (رب العالمین)
بۆ دۆستی دلسۆز، کاکی خوێن شیرین
دوکتۆر سۆرانی، خالە نەسرەدین
شادو دلخۆش بی قەت نەبی غەمگین

برای بەڕێزم دوکتۆر (سۆرانی)
سەلامون عەلێك ئەی برای گیانی
نامەت گەیشتە مەلا ڕەحمانی
یاخوا هەربژیو هەزار ئافەرین

نامەی دکتۆرەو دابووی بە (دوختەر)
هاتبو لەمەرگەو بیتوێنو پشدەر
پڕبوو لەباسو هەواڵو خەبەر
بەخسووس هەوالی (حاجی سەیدەمین)

شیعری نەسرەدین زۆر بەڕەوانی
بەزمانی شیرنی کوردی سۆرانی
بۆ مەلای گوندی گرد ئاشەوانی
گوندی ڕازاوە بەلالەو نەسرین

(صباح الخير) ئەی (صباح النور)
سڵاو لە دۆستی ئەودیوی سنوور
بەو شیعرە جوانەت هاروژا شعوور
کولاوە لە دڵ هەزاران برین

مەمنونت کردم بەو نامەجوانە
ئەوەش هیممەتی (حاجی و سەیدانە)
ئەو حاجی سەیدەی لەوێت جیرانە
(حاجی سەید عەزیز) بەڕێزو تەمکین

دەپرسم حالی خاوو خێزانت
بابو داك فاتمەو کچەکەی جوانت
چڵ ماڵ لەدۆستو دەرو جیرانت
لە کیژی جوانی شۆخی نازەنین

(حاجی سەیدەمین) تاجی سەرسەرە
باپیری (کاوەو کاکەو ڕێبەرە)
(كاك سەید عەلی) نووری بەسەرە
بۆ (سەید عەلی) دەکەم زارو شین

بۆ كاك (مستەفا) و (حەمە کاکە ڕەش)
سڵاوی گەرمم دەکەم بەسێ بەش
بە (کاوەو ڕێبەر) دڵم دەبێ گەش
ئەو دوو نەمامە جوان بکەن پەرژین

(سەید برایم) و (حەسەن) و (ڕەسووڵ)
(حاجی) و (مستەفا) و کاك (مارف) ی ماقووڵ
ئەی (مچە) و (حوسێن) کوڕی بە وسووڵ
کوا پیاوی وەك وان لەسەر ڕووی زەمین؟

خولاسە هەمووسەیدی سەنگەسەر
ئەوەی لە ولاتیان کران دەربەدەر
سلاو دەنێرم بۆ هەموان یەکسەر
(حاجی سەی برایم) و (مامۆستای نوورین)

شوکر بۆخودا زۆرباشە حالم
بێ ئێوە ناخۆش پڕ لەشتە مالم
سەیر گۆڕاوە قەدو گیپالم
شل و شەوێقم وەك (مەلا نەسرین)

حاڵو بالەکەم زۆر ڕێكو پێکە
یەك دەلێ لاچۆ یەك دەلێ تێکە
خزمەتگوزارن ئەهالی دێکە
هەموو نوێژکەرو خاوێنو بەدین

ماستو کەرەو ڕۆن بەپێی فیلانە
مشك لە مالمان دەکەن دیلانە
خواردیان ئەو گەنمەی دەلێی شیلانە
کەوتوونە بەزمو سەماو هەلپەڕین

هەمووشت زۆرە لە گردئاشەوان
نۆكو گەنمو جۆ، كوولەكەو گولەدان
حەوشەو حەسارو وەتاغو هەیوان
قازو كەلەشێر مراویی نەخشین

هەنگوینو پەنیر، شیرێژو لۆرك
قەت بەتاڵ ناكەن كیتەلەو جۆڕك
هەمووشت خۆشە بەمایەو مۆرك
گوێزو مێوژو سێو لەگەڵ ئەنگەبین

چت نەنووسیوە لە (تەنیا ئاكۆ)
هەر وەك جارانە بەینی لەگەڵ تۆ
هیوام پێتانە بێنەوە سەرخۆ
برام هیچ نییە دەعیەو بوغزو كین

بەفرو بەستەلەك با كۆتو كرێوە
پیاوی ڕەق دەكەن بڕوا بەڕێوە
هەر وەك قەندیلە برام ئەو نێوە
پیاو لەبن سۆبەی نای مێنێ حەجمین

تەپالەو دارمان پڕ بە تەویلەن
وەك پۆلووی بەڕوو خاس سەر سەبیلەن
كارەبان لۆكسو لامپاو فتیلەن
بێ شۆقن وەكو پیاوی بێ ئەوین

پارەمان داوە کارەبان بۆ دێ
دارتێل چەقاون لەشار هەتا دێ
سیم کەشی زۆرماڵ کرا جێبەجێ
کارەباو بەرق سەرچاوەن بۆ ژین

مالت ئاوەدان برای خۆشەویست
لە تۆی بە وەفا هەر ئەوەم دەویست
بۆ لە (مستەفا) هیچ شیعرم نەبیست؟
ئێستاش هەر زیزە کاک لە پێکەنین؟

**١٩٩٢/١/١١ گردئاشەوان**

---

شاعیری میللی :نەسرەدین محەممەد سەعید: نازناوی شیعری (دکتۆر سۆرانی) یە. لە دایکبووی ساڵی ١٩٥٧ و دانیشتووی شارۆچکەی سەنگەسەرە.

دختر..کچ

مستەفا: نووسەرو شاعیر مامۆستا مستەفا سەید مینە.

( ٦ )

# نامەیەك بۆ ( حاجی مەلا عەبدوڵڵای بانی )

بــرای بــەرزو بــەڕێــز، ئــەی کــاکــی شــاری
ئــەتــۆش وەك مــن لــە زســتــان داخــداری
عــەزیــزم نــووری عــەیــنــم (حــاجــی عــەولا)
هــیــوای بــەرزیــم هــەتــاکــەی ئــیــنــتــیــزاری
عــەســای دەســتــی مــنــی پــیــرو پــەرێشــان
شــیــفــای دەردی نــەخــۆش‌و بــێ قــەراری
دەوای زامــی دڵــی حــەیــران‌و خــەســتــەم
کــلــیــلــی فــەتــح‌و شــادی‌و بــەخــتــیــاری
بــە ئــەو زســتــانــە بــۆچ نــاپــرســی لــێــمــان
وەرە بــا پــێــت نــەبــێ، ســەوقــات‌و دیــاری
کــەپــێــت خــۆشــە تــەمــاشــای دیــمــەنــی جــوان
وەرە قــەنــدیــل و (شــەرگــە) و (جــنــدەواری)
(گــەلالــە) و (کــەوگــەز) و (گــامــۆڵ) و (کــۆتــرەل)
(گەدە) و (لـەنـد) و (حـەسـارۆسـت) و (حـەسـاری)
بــەهــاران خــۆشــە ســەحــراو دامــەنــی کــێــو
بــەهــەشــتــێــکــە بــە ڕاســتــی کــوردەواری
تــەمــاشــای شــاخــی پــڕ گــیــابــەنــدو نــەســریــن
وەکــو بــووك ســوورە دەشــت‌و بــەر پــەســاری

بەهارەو خاکەلێوە، بەفری زستان
لەبەر بای وەعدە نامێنێ قەراری
لە دەم چۆمو شەتاوان دەستەدەستە
کوڕو کیژ پیرو منداڵ دێنە یاری
بە کوێی شار هەڵبڵێم، بۆ خۆشیی قوربان
کە تەنراوە هەموو گۆشەو کەناری
بەلام لادێ بەهەشتی سەرزەمینە
بە گوڵ نەخشاوە دەشتو چیاو نزاری
شوکر لێرە ئەوەند زۆرە گژو گیا
(کوڕادە) و (کارگ) و (کەنگر) دێن بە باری
(کەما) و (مەندۆك) و (بیزا) و (نێرکە ڕێواس)
بە وانە خۆشە کوردستان، بەهاری
هەزار خۆزگەم بە ئەو وەختەی هەوارچی
بەرەو کوێستان دەچوو هۆبەو هەواری
لەسەر کانیاوی ساردو مێرگی زەنوێر
لە قاقای بێریەکان شەکەر دەباری
ئەوەی جاران بەهەشتی کیژو کوڕ بوو
ئەوێستا هیچ نەماوە ئاسەواری
لەسەر گوڵ بولبولی شەیدا شەوو ڕۆژ
دەخوێنێ شیعرو ئاوازو وتاری
لەسەر دوندی چیاکان، کەو تەقو جووت
لە بۆ ڕاوکەر دەڵێن سێگاو قەتاری

لــە داوێــنــی چــیــاو دەشــتو خــڕو دۆڵ
لـەســەر بــەرگـی گـوڵان شــەونــم دەبــاری
لـە لایـەك شـوانو گـاوانـەو بـەعـەی مـەڕ
لـە لایـەك زەمـزەمـەی قـومـریو هـوزاری
لـە لایـەك كـاكـی جـوتـێـر ڕۆژ هـەتـا شـەو
لـەگـەڵ گـازەردو گـاسـوور شـێـوەكـاری
لـە لایـەك شـەنـگـەبـێـریـی شـۆخو شـەنـگـە
لــە لایــەك چــیــغو ڕەشــمــاڵــەو دەواری
لە لایەك كیـژو كوڕ بۆ (پـنـگ) و (لووشـە)
بــە پــۆل دێــنو دەچــن بــۆلای بــنــاری
لە لای تـر (فـاتـیـحـی) حـەیـرانو بـێ هـۆش
لـە دێـی گـردئـاشـەوان خسـتـوویـە بـاری

**١٩٩٢/٢/١٠ گردئاشەوان**

---

**- حاجی مەلا عەبدوڵڵای بانی: لە ساڵی ١٩٣٢ لە گوندی (كانی سێو) ی گەورکی موکری لەدایك بووە. هاوڕێ و ئامۆزای شاعیر بووە زۆربەی دەورانی خوێندنیشیان بەیەكەوە بوون. ساڵی ٢٠١٣ لە شاری پیرانشار كۆچی دوایی كرد.**

## ( ٧ )

# نامەیەك بۆ كاك ( مەلا بایزی مەنگوڕ )

ئـەی بـرای بـەرزو بـەڕێـزم، (بـایـەزیـد) دۆسـتـی قـەدیـم
ئـەی ڕووناکـی هـەردوو چـاوم، مـەرهـەمـی قـەلـبـی سـەقـیـم
ئـەی گـولـی دەشـتـی (نـەلـێـن) و شـۆڕەسـواری لای (گـەدە)
ئـەی عـەزیـزی خـۆشـەویـستو نـەرمو ئـارامو حـەلـیـم
ئـەی ڕەفـیـقـی کـۆنـەسـاڵو هـاودەمـی دەورانـی زووم
جـاروبـار گـەر تـۆ نـەبـیـنـم جـا ئـەمـن چـۆن وا دەژیـم؟
کـاکـە خـۆ قـەولو قـەرارمـان وا نـەبـوو نـەتـبـیـنـمـەوە
بـۆ نـەهـاتـی، عـیـلـلـەتـی چـی بـوو؟ کـوڕی شـۆخو نـەجـیـم
زۆر لـە مـێـژە چـاوەڕێـتـم هـەر نـەهـاتـی (بـایـزە تـیـو)
قـەولـی تـۆ (بـەولـن) دەزانـم پـیـری بـێ خـوانـی لـەئـیـم
سـوێـنـد بـە چـاوی تـۆ بـراکـەم قـەت لـەدڵ نـاچـیـتـە دەر
خـۆشـەویـسـتـی تـۆ لـە دڵـدا بـۆتـە خـوێـنـی جـەرگو سـیـم
تـا ئـەتـۆ بـووی کـاتـی لاویـت، کـێ هـەبـوو کـۆخـەی بـکـات
مـەعـدەنـی لـوتـفو کـەرەم بـووی، خـاوەنـی تـەبـعـی سـەلـیـم
چوونی (بێژو) ێت چـەنـدە خۆش بـوو، تۆو (لـەتـیـف) و (دافـعـی)
بـاخـەوان گـوڕانـدی دەیـگـوت: بـایـزە لاچـۆ ئـەی خـەشـیـم
شـاگـولـی بـاغـی ئـەمـەل بـووی، نـەحـلـیـی ئـاراو نـوکـتـەزان
مـەرهـەمـی دەردی دڵان بـووی، وای دەگـوت (ئـاغـای سـەلـیـم)
دەردی بـێ دەرمـانـە دەردت پـیـریـەو کـاریـگـەرە

ڕوو لــەلات نــاکــا لــە تــۆ تــۆراوە فــاتــەی پــوور حــەلــیــم
گەر لە (بێ شاسپ) نـەخۆش بووی چوومـە گونـدی (تـووژەڵـە)
حــالــەتــێــك دایــگــرتــی دەتــگــوت (هــذهِ أمْــرٌ عَــظــیــم)
پــــیــــری دەردێــــکــــی گـــرانــــە و زۆرکـــەســـی تـــوانـــدۆتـــەوە
ســەیــری زارو لــەوســی خــۆتــکــە، چــارەیــی نــاکــا حــەکــیــم
پــیــرە دالاشــی (ســپــی ســەنــگ) خــەرتــەلــی قــەنــدیــلــی کــورد
ڕووحــی شــیــرنــم (قــالــە بــایــزە)، پــیــرە کــالــیــاری ڕەمــیــم
ڕۆژەکـــەی ئـــەوســـات لـــەبـــیـــرەو پـــرتـــەپـــرتـــی پـــیـــرەزاڵ
جێت نـەبوو خـۆی تـێـگـری، دەتـگـوت تـەمـاشـای مـووی سـپـیـم
ئــێــســتــەکــە خــەلــکــی بــە شــیــرو خــەنــجــەران ژن لــێــی دەدا
ســەد شــوکــر تــۆ ئــێــســتــە بــاشــی، کــێ دەڵێ (دەدمــت دەڕیــم؟)
فــکــری دنــیــات هــێــنــدە زۆرە قــەت کــەســت نــایــێــتــەبــیــر
(گــۆلــەبــۆر) تــۆی بــۆ دروێــان، بــۆچــی دەتــگــوت مــن ســەخــیــم؟
ئــێــســتــە پــێــتــوایــە کــە دنــیــا هــەر ئــەتــۆی تــێــدای‌و بــەس
هــیــچ کــەســت پــێــش چــاوی نــایــە، تــاق‌و تــەنــیــاو بــێ نــەدیــم
تــەبــعــی شــیــعــرم نــووســتــوە زۆر مــوشــکــیــلــە هــەســتــانــەوەی
وانــەبــێ چــۆن بــۆت دەنــووســم شــیــعــری بــێ مــەعــنــاو عــەقــیــم
ڕۆژو شــەو دەســتــەو دوعــامــە ڕوو لــە دەرکــەی حــەق دەکــەم
بۆ (ڕەسوو) (عوسمان) (عەلی) هەم بۆ (حـەمـە) و (مـولـلا کـەریـم)
(فــاتــیــحــی) دۆســتــت کــەوا پــیــرو زەعــیــفــەو نــاتــەوان
لارلار دەڕوا بــەرێــداو تــۆی لــەبــیــرنــاچــێ هــەتــیــم
**١٩٩٢/٦/٣ گردئاشەوان**

هەرپێنجیان کوڕی مامۆستا مەلا بایزن.

## ( ٨ )

# نامەیەك بۆ ( میرزا عەلی مەعروفی )

ئـاغـای مـەعـروفـی ڕەئـیـسـی نـەوت
لـە تـرسـی زسـتـان لـەرزم وێ کـەوت
وا پـایـز داهـات بـەرەو زسـتـانـە
هـۆدێـکـم هـەیـە عـەیـنـی ئـەشـکـەوت
گـەرم دانـایـەت بـێ نـەوتو گـازۆڵ
زریـانـیـش ئـەوا وەسـەر گـەڕ کـەوت
بـەفـرو بـارانو زریـانو شـەمـاڵ
بـۆ مـاڵـی فـەقـیـر بـۆیـان هـەڵـکـەوت
گەر لوتـفـێك نـەکـەی بـۆ سـوختـی زسـتـان
سـەرمـا هـۆدەکـەم لـێـدەکـا زەوت
بـۆ مـامـۆسـتـاکـان تـۆ کـانـی نـەوتـی
بـۆ مـاڵـی مـەلاو حـوجـرەو مـزگـەوت
لـە گـردئـاشـەوان لـەو سـیـاکـێـوە
نـەداری بـەڕووەو نـە مـازوو و کـەوت
هـەر تـەپـاڵـەیـە سـوخـتـی زسـتـانـە
جـا ئـەوەش بـەخـتـە چـیـم بـۆ ڕێـکـەوت؟
بـیـکـە پـیـاوەتـی پـێـنـج بـەرمـیـل گـازۆڵ

دوو بـۆشـکـەش نـەوت دەبـێـتـە حـەوت

هـەرچـەنـد بـەش نـاکـا هـەتـا بـەهـارێ

خـوایـە زۆرشـوکـرم هـەرچـی دەسـکـەوت

دەفتـەرچـەو کـۆپـین هـیـچـیان شـك نـابـەم

بـــۆیــــە وا کـــاکـــت وەمــــالان کــــەوت

دوعـات بـۆ دەکـەم سـەربـەرزو شـادبـی

مـــیـــوانـــت نـــەبـــێ مـــەلـــەکـــولـــمـــەوت

(ئاشـوفـتـە) و بـێ حـاڵ بـێ دۆسـتو هـاودەم

بـەوەی خـۆش بـەخـتـم تـۆم وەدەس کـەوت

**۱۹۹۱/۹/۱۰ گردئاشەوان**

## ( ٩ )

# نامەیەك بۆ ( مامۆستا مەلامحەممەدی زوودی )

(زوودیـا)، عـالـی جـەنـابـا، دۆسـتـی بـێ لافو گـەزاف
بـانـیـی قـەسـرو قسـوور، ئـەی خـاوەنـی شـاوڵو تـەنـاف
خـوایـە هـەر شـادو بـە کـەیـفو تـەڕنـیـشـات بـی ڕۆژو شـەو
هـەر وەکـو زاوا کـە مـەسـتـە بـۆ شـەوی حـیـجـلـەو زەفـاف
بـۆچـی لـێـم لالـووتـی؟ بـەیـنـێـکـە ئـەبـەد لـوتـفـت نـیـیـە
چـۆلـە زۆر بـێ ڕەونـەقـە بـێ تـۆ بـرام سـەحـنـەو مـەسـاف
تـۆ وەکـو چـاکـی فـەقـیـران وای لـە بـۆ خـەڵـکـی هـەژار
دێـنـەلات تـاق تـاقو جـووت جـووت، بـۆ زیـاراتو تـەواف
عـەیـبـە زۆر عـەیـبـە دلـم بشـکـێـنـی بـێ سـووچ و خـەتـا
بـاری کـردوە لام نـەمـاوە شـادیـی و بـەزمو شـەفـاف
بـۆ مـەگـەر سـووكو چـرووكو بـێ ڕەواجـە پـوولـی مـن
بـۆ مـنـی بـێـچـارە بـۆچـی سـاز نـەبـوو دانـێـك شـکـاف؟
بـۆ کـتـێـبـانـم دەوێـت مشـکـان هـجـوومـیـان کـردووە
سـیـکـەسـیـكو نـەعـرەیـانـە دەم بـە ئـاوازو هـوتـاف
وەزعـەکـەم ئـێـسـتـا لـەمـیـزان دەرچـووە پـیـس لـێ دەدات
وەك سـەعـاتـی (چـالـمـە) یـە دڵ، یـا گـونـی کـابـرای نـەداف
وەك (حـەمـە تـالـێـك) حسـابـت کـردبـا بـۆ مـنـی خـزم

بـردیـەوە مـالـێ بـە دەسـتـێـك خـالـی بـوو وەك سـاوی سـاف
بـۆ (مـەلای نـەوزادی) سـازت كـرد، نـەك یـەك دووی ڕێـكوپـێـك
بـیـخـەمـە مـل خـۆم لـە داخـانـت دەلـێـم پـەتـكو تـەنـاف
(فـاتـیـحـی) چـیـدی مـەشـێـلـە (زوودی) ئـەو سـاڵ یـەكـتـەنـە
سـاز دەكـا بـۆت دانـەیـەك گـەر تـەخـتـە بچـتـە كـێـوی قـاف
**گردئاشەوان ١٩٩٥/ ٦/٧**

---

**مامۆستا مەلا محەممەدی زوودی شاعیر: لە دایكبووی ساڵی ١٩٣٩یە. یەكێك لە هاوڕێ نزیكەكانی شاعیربوو. مامۆستا زوودی جگەلەوەی شاعیرێكی جوان نووسە، لە زۆر بواری دیكەشدا دەست ڕەنگینە وەكو. دارتاشی، ڕادیۆسازی، سەعات سازی، بەننایی، خۆشنووسی. ئێستا لە گووندی (قەبری حسێن) ی سەر بەشارستانی پیرانشار دادەنیشێ. بەداخەوە تا ئێستا دیوانە شیعرەكەی چاپ نەكراوە.**
**شكاف... دۆڵاب.**

## ( ١٠ )

# نامەیەك بۆ ( حاجی مەلا عەبدوڵڵای بانی )

بــرای خــۆشــەویســت عــەبــدولــلای بــانــی
حــاجــی مــامــۆســتــای لای (ســەرووکــانــی)
ســەلامــون عــەلــێــك ئــەی نــووری چــاوان
نــووری چــاوی چــی!! ڕووحــی ڕەوانــی
گــەورەی بــەڕێــزم حــاجــی مــامــۆســتــا
تــاجــی ســەر ســەرم لــە دنــیــای فــانــی
تــیــشــکــی ڕوونــاکــی دلــەی پــڕســۆزم
ئــومــێــدو هــیــوام بــۆ زیــنــدەگــانــی
چــرای گــڕســۆزی هــۆدەی دەروونــم
خــەمــڕەوێــنــی دڵ، هــۆی شــادمــانــی
گــولــی بــێــگــەردی ڕەوەزو هــەلــدێــر
ڕوحــە شــیــرنــەکــەی عــەبــدولــڕڕەحــمــانــی
دلــم وەك مــەنــجــەڵ لــەکــوڵو لــە جــۆشــە
لــەبــەر بــێــکــەســیو حــاڵ پــەرێشــانــی
خــۆشــیو نــاخــۆشــیــم هــەر لــوتــفــی تــۆیــە
بــە ســەیــدی زەمــبــیــل، بــە غــەوســی ســانــی
هــەر تــۆ شــك دەبــەم خــەمــڕەوێــنــی خــەم
بــۆچ نــاپــرســی لــێــم ئــەی بــرای گــیــانــی؟
بــفــەرمــوو چــۆن بــووی، لــەو تــەقو تــۆقــە؟
لــەگــەڵ ئــەو بــەفــرەو تــەرزەو بــارانــی؟

بێژە بەو بەفرە ئەحواڵت چۆنە؟
چونکە چەند ساڵە دوورە زستانی؟
شکستو بەستو دڵۆپەو باران
لەو چوار پێنج ڕۆژە، چیان بەسەر هانی؟
تۆ وەك ئێمە نی زۆر دوورە شاری
بێ گۆشتو سەوزەو ترێ و باینجانی
ڕێگەی ماشێنتان وەك جاران نییە
بە بەفرو سەهۆڵ سەختە گەڕانی
کەرو بارگینو یەستریش نەماون
سوار بی بێیە شار لەسەر کورتانی
پەتاتەو پیواز، ڕۆنو قەندو چا
وەدەس دەکەون ئەویش بە گرانی
برام کوا وایە شەرتی برایەتی
کاکم خۆی تێر بێو خەلکی بە گونانی؟
لە (گردئاشەوان) لەو دوورە شارە
چاوەڕوانی تۆم بۆخۆت دەزانی
فەقێکەش نەهات بۆ حوجرەی ئێرە
دەرسم پێگوتبا بە پووختیو جوانی
ناشکوری نەبێ مزگەوتەکەشمان
دڵۆپان دەکا جێی نوێژەکانی
شەوو ڕۆژ جێگەم بن سۆبەی ماڵە
وەك خەرتەل کەوتووم لە بەر چاو نانی
هیچ کەس شك نابەم لەو دەوروبەرە
تەنیاو ڕووتو قووت عەینی زیندانی

خەڵکی دەڵێن کوا دۆستو ئاشنات؟
دیارە تۆ خەڵکی لای موکریانی
لە لایەك بەفر سەرو دڵی گرتووم
سەی (مینە قازیش) سەر ڕێگەی کانی
سۆبەم گرمەی دێ بەتەپاڵەو دار
وەك سۆبەی نەوت نابڕێ کاودانی
مەلاژن چۆنە (ماریا) و (سەفیە خان)
(تەها) و (جەماڵ) و (کاوە) ی داستانی؟
(ڕووناك) و (گولان) (کامیل) ی نازدار
یاخوا هەربژین بە کامەرانی
شەوێك دێم دەچین لە بۆ لای کاکت
خالی کوڕەکانو خاوو خێزانی
(دۆنەخۆر) خواردی هەزارو پێنج سەد
بە خۆو مزگەوتو بە فەقێکانی
با نووشتەی ئێمەش بڕوا بەفیڕۆ
خۆ ئی تۆی زاوا نەیبوو نووقسانی؟
دەڵێ بۆ چیانە مەلای خۆمانەن
نوشتەن بۆ دەکەن زۆر بە هەرزانی
خەتای خۆمانەو با وان بەسەر بێت
وەك (سەید قادر) گەر دەمانزانی
لە هەزارو پێنج نەهاتبایەنە خوار
هەزاریان دەدا زۆر بە ئاسانی
لە مەولودنامەش بێبەش کراوین
هەمووی (دۆنەخۆر) خستیە گیرفانی

شـەوێـك دەیشـێـلـیـن زۆر تـێـرو تـەسـەل
شـەو لـەوێ دەبـیـن هـەتـا بـەیـانـی
دەبـێ سـفـرەشـی زۆر ڕازاوە بـێـت
مـۆز، هـەنـار، هـەرمـێ، تـرێـی سـەعـدانـی
كـاهـو و گـنـدۆرەو سـێـوو پـرتـەقـاڵ
شـیـریـنـیـش ئـەنـواع، نـۆشـابـەكـانـی
ئـەگـەر دەزانـی لـە دڵـت گـران دێـت
خـۆت لـەجـیـاتـی ئـەو وەبـەر دە شـانـی
خـوایـە بـۆ خـاتـری بـەشـیـرو نـەزیـر
بـووبـەكـرو عـومـەر، عـەلـیو عـوسـمـانـی
ئـەو قـەبـرەی پـڕە لـە دووپشـكو مـار
بـاخو بـاخـات بـێ تـا چـاو دەڕوانـی
لـە بـەهـەشـت زیـاتـر چـی دیـكـەم نـاوێ
قـەسـرو قسـوورو حـورو غـیـلـمـانـی
خـوایـە (فـاتـیـحـی) نـەكـەی ڕەنـجـەڕۆ
سـەهـلو ئـاسـان كـەی حـەشـرو مـیـزانـی
**١٩٩١/١٢/١٠ گردئاشەوان**

## ( ١١ )

# نامەیەك بۆ كاك ( مەلا مستەفای ئەحمەدی )

شـــەمـــاڵ دەخـــیـــلـــم بـــەبـــێ ڕاوەســـتـــان
بـــڕۆ لای ســـەردەشـــت بـــۆ لای ســـێ دۆســـتـــان
ســـێ نـــەونـــەمـــامـــی خـــونچـــەی دەرو دەشـــت
ســـێ شـــۆڕەســـواری ســـەردەســـتـــەی مـــەســـتـــان
ســـێ كـــوڕ لـــە ســـێ دێ وەك بـــاخـــی بـــەهـــەشـــت
ســـێ لاو ســـەرتـــۆپـــن لـــەنـــێـــو كـــوردســـتـــان
بـــــۆ لای ســـــێ گـــــولـــــی ڕازاوەی ولات
دانـــیـــشـــتـــووی ســـێ جـــێـــی پـــڕ بـــاخو بـــێـــســـتـــان
ســـێ چـــەپـــكـــە گـــولـــی بـــۆنـــخـــۆشو ڕووگـــەش
هـــەلالـــەو بـــەیـــبـــوون وەنـــەوشـــەی كـــوێـــســـتـــان
یـــەك هـــێـــزی ئـــەژنـــۆ قـــووەی ئـــەنـــدامـــە
(ئـەحـمـەدی) ە ، جـێـگـەی لـە گـونـدی (زووران)
(زووران) هـــەرچـــەنـــدە زووركـــەو دێـــمـــە كـــار
بـــەلام ســـەرچـــاوەس بـــۆ بـــیـــورو هـــەســـان
(عـــەبـــدولـــلای كـــەیـــوان) ڕۆڵـــەی مـــامـــۆســـتـــام
(حســـێـــنـــی كـــەیـــوان) ئـــەویـــان لـــە (بـــێـــوران)
(عـــەبـــدولـــلا) ی دووەم ڕەشو خـــوێـــن شـــیـــریـــن
پـــێـــش نـــوێـــژە ئـــەویـــش وا لـــە (نـــیـــشـــكـــۆلان)
ســـــۆمـــــای دووچـــــاون ڕووحـــــی ڕەوانـــــن
یـــاخـــوا هـــەر شـــاد بـــن دوور لـــە هـــەر نـــوقســـان

زۆر بــە تــامو خــوێـن قســەو گــوفــتــاریــان
ئـــاگـــاداریـــان بـــێ خـــودای بـــێ مـــەکـــان
(بـێـورانـی خـوارێ) و (نـیـشـکـۆلان) هـەرتـك
مــەعــدەنو جــێــگــەن بـۆ خـۆشـەویسـتــان
چ بـڵـێـم لـە وەسـفـی ئـەو دوو سـێ دێـیـە
دووره لـــە تـــوانـــای بـــەنـــدەی مـــالـــوێـــران
(جــنـــات تـــجـــری تـــحـــتـــهـــا الانـــهـــار)
(مــا زاغ الــبــصــر) لــە مــنــی نــوقســتــان
شــەمــاڵ تــوخــواکــەی لــە (کــاســە بــەردیــن)
دەســنــوێــژت بشـۆ پـاك خـاوێـنو جـوان
ئـەوجـار بـە وێـنـەی (حـەمـەی گـۆمـانـی)
تــێــهــەڵــکــە مــەقــام، ئــاوازو بــەســتــان
بـڵـێ بـە نـەغـمـەو لـەهـجـەی حـیـجـازی
هــۆکــاکــە مســتــۆ بــۆم هــێــنــای بــۆســتــان؟
ڕاســپــاردەم هــاتــووم ســەوقــاتــم پــێــیــە
دیـاریـی چـوکـەی خـۆت لـە (گـردئـاشـەوان)
بــوســتــانــی ســەعــدی ســەرچــاوەی هــونــەر
لــە بــوســتــان خــۆشــتــر مــەگــەر گــولســتــان
بچــۆره مـــالـــی مـــامـــوەســـتـــای گـــونـــدی
(زووران) لـــەســـەرخـــۆ هـــەڵـــدەوە پـــەردان
تــاوێــك ڕاوەســتــەو ئــەوجـار بـە تـەمـکـیـن
وەك خــزمــەتــکــاران ڕامــووســە دەســتــان
دەســـتو داوێـــنو ڕیشـــەکـــەی مـــاچـــکـــە
بـــیـــخـــە ســـەر ســـەرت تـــۆزی کـــەوشـــەکـــان

بــڵــێ ڕاســپــاردەم چــم لــەســەر نــیــیــە
هــەردەبــێ وابــکــەم نــاچــارم قــوربــان
لــێــم قــبــووڵ بــکــەو ڕووم لــێ تــاڵ مــەکــە
شــەرمــەنــدەم نــەکــەی دەخــیــلو ئــامــان
گــەرچــی دیــاریــەکــەم زۆر نــاتــەواوە
ئــاڵــەکــۆك دەبــەن بــە دیــاری شــوانــان
مــنــیــش وەك شــوانــێــك بــەو پــایــزە ساردە
پــێــشــکــەشــت دەکــەم دە بــابــەی بــوســتــان
لــە (عــیــشــق ) و (ڕەزا) و (تــۆبــە) و (مــونــاجــات)
(ئــیــحــســان) (قــەنــاعــەت) (تــەوازوع) ی جــوان
لــە (تــەربــیــەت) و (عــەدل) و (شــوکــر) ی حــەق
درێــغــی نــەکــەی دەســتــم بــە دامــان
ئــەوەیــە دیــاری کــوردی دۆنــەدیــو
بــرای خــۆشــەویــســت کــاك (مــســتــەفــا) گــیــان
جــەواهــێــرەکــەش شــەوچــرای شــەوە
ڕوونــاکــیــیــە بــۆ دڵ شــەو هــەتــا بــەیــان
ئــەو گــوڵو گــوڵــزار ئــەم نــووری دڵان
نــوور لــەســەر نــوورە بــیــخــوێــنــی شــەوان
فــەرمــوودەی ســەعــدی دوڕو گــەوهــەرە
گــوێ بــگــرە چــلــۆن دەڵــێ بــە ئــیــنــســان
بــڕۆ ژن بــێــنــە بــرام گشــت بــەهــار
تــەقــویــم کــە کــۆن بــوو مــەیــخــەرە گــیــرفــان
داخــی گــرانــم پــیــریــیــەو هــەزار دەرد
خــۆم بــولــبــولــێــك بــووم وەخــتــێ لــە شــاخــان

ئـێــســتــاکــەش پــیــرم بــێــهــێــزو تــاقــەت
شــوکــرم لــێــم نــەدەن مــنــداڵو خــێــزان
لــەخــۆت تــێــك نــەدەی بــلــێــی ژن دێــنــم
ڕۆیــنــت پــێــنــاکــرێ پــێــت نــەبــێ گــۆچــان
کــلاوت بــگــره بــا لــێــت نــەڕفــێــنــێ
ئــەو مــالــە خــۆشــەت نــەکــەی بــە زیــنــدان
وەك پــایــز گــەلای ژیــن زەرد هــەلــگــەڕا
هــەربــیــنــا ڕەگ و ڕیشــەی هــەلــپــســان
ڕەشــەبــای ئــەجــەل کــەوتــۆتــە ســەر گــەڕ
لاوو پــیــرو جــوان دەخــاتــە قــەبــران
مــنو تــۆش هــاکــوو نــۆبــەن گــەیــیــە ســەر
بــار کــەیــن بــۆ ولاتو شــاری خــامــۆشــان
لــە دوعــای بــەخــێــر بــێــبــەشــمــان نــەکــەی
مچــە گــردەلــەی خــۆش نــوتــقو بــەیــان
تــەیــری خــەیــالــم دەفــڕێو دێــتــە لات
ســەرگــەردانو وێــڵ، عــاجــز، پــەرێشــان
(یــاشــافــی الــهــم، کــافــی الــمــهــمــات)
(فــاتــیــحــی) نــەکــەی بــێــبــەش لــە ئــیــحــســان
**١٩٩٥/١٠/٩ گردئاشەوان**

---

دە بابەی بوستان دە بەشەی بوستان.

# سەفەر نامە

( ١ )

ئـــەوەڵ بـــەنـــاوی خـــودای بـــانـــی ســـەر
دانـــەری ئـــەرزو بـــەهـــەشـــتو ســـەقـــەر
خـودای بـەخشـنـدەو غـەفـورو کـەریـم
بـۆ گـونـاهـبـاران ڕەحـمـانو ڕەحـیـم
سـەلاتو سـەلام لـەسـەر پـێـغـەمـبـەر
هـەم ئـالو ئـەسـحـاب تـا ڕۆژی مـەحشـەر
ئـەوجـار گـوێ بـگـرە بـرای خـۆش نـەزەر
تـا بـۆت بـەیـان کـەم چـۆنـیـەتـی سـەفـەر
جومعەی بیـسـتـی حـەوت بـە ژمـارو عـەدەد
ســالـــی هـــەزارو نـــۆســـەدو نـــەوەد
لـەگـەڵ مـەلاکـان سـەفـەرێ هـەلـکـەوت
سـەفـەرێـکـی خـۆش ئـەویـش بـەڕێـکـەوت
ئـەو مـەلایـانـەی کـوڕی سـەفـەر بـوون
لـە (حـاجـیـاوا) دا خـاوەن نـەزەر بـوون
(مـەحـمـود ئـیـبـراهـیـم) ئـیـمـامو خـەتـیـب
بـۆ سـەفـەر چـالاك مـەحـبـوبو نـەجـیـب
حـاجـی مـامـۆسـتـا (ڕەسـوڵ بـاداوە)
حـاجـی (عـەبـدولـلا) ش هـات وهـۆی داوە
چوارنەفەر ساز بـوویـن بـە داب و دەسـتـوور
گـرتـمـان سـەیـارەی کـاك (ڕەسـولـە سـوور)

هـەتـا (قـەمـتـەران) خـۆن لـێـکـردە بـار
پـارەی لـێ سـەنـدیـن ئـەویـش پـێـنـج دیـنـار
گـەیـنـە قـەمـتـەران بـە گـورجـیو تـونـدی
ڕوونـکـردە مـاڵـی مـامـۆسـتـای گـونـدی
لـــە دەرگـــامـــان دا، مـــەلا هـــاتـــەدەر
جـوبـبـەی فـڕێ دا، نـایـە سـەر مـێـزەر
بـە دیـتـنـی ئـێـمـە گـەش بـۆوە وەك گـوڵ
لانـکـەی بـردنـە دەر، خـۆشـی کـرد مـەنـزڵ
فـەرمـانـی چـایـدا، مـاسـتـاویـان هـێـنـا
قـوڕاویـلـکـەیـان بـە مـریـشـکـان لـێـنـا
قـەرارمـان وابـوو گـۆشـت گـیـسـك نـەخـۆیـن
بـەربـەسـێـڵ سـازبـێ بـیـخـۆیـنو بـڕۆیـن
پـلاوو گـۆشـتو بـامـیـەو بـایـنـجـان
کـەلـی تـێ نـاچـێ سـفـرەو نـانو خـوان
کـە جـومـعـەمـان کـرد بـەو گـەرمـا تـاڵـەی
بـۆ نـانـخـواردن هـات (ئـەحـمـەدی خـاڵـەی)
دوای ئـیـسـراحـەتو نـانو چـا خـواردن
بـۆی وەخـۆ کـەوتـیـن بـۆ وەڕێـکـەوتـن
گوتمان دەی فەرموون چـیـدی نـەبـیـن گـیـر
بـۆلای (دەڵـگـەیـی) و (مـامـۆسـتـا بـەشـیـر)
مـەلای خـانـەخـوێ گـوتـی ڕاوەسـتـن
بـا دیـاریـن پـێ بـێ بـۆ جـێـی مـەبـەسـتـن
مـەلا بـانـگـی کـرد (لـوقـمـان) ئـاوەرە
بـنـبـە چـوارقـوڕنـە بـۆ ئـەو سـەفـەرە

لـوقـمـان مـەردانـە سـەیـارەی هـانـی
بـەرەو چـواقـوڕنـە لـێـیـخـوڕی بـە جـوانـی
لـەو نـەقـلـیـاتـی پـڕ بـگـرەو بـەردە
تووشـمـان بـوو بـەتـووش ئـەو پـیـاوە مـەردە
کـاك (فـەقـێ ڕەسـووڵ خـدر مـام وسـێـن)
بـەخـۆیو (ئـازاد) وەك بـازو شـەهـێـن
گـوتـی مـەلایـان لـەبـۆ کـوێ دەچـن
گـەلـێ زەحـمـەتـە لـەدەسـتـم دەرچـن
گـوتـمـان سـەفـەرەو دەچـیـن بـۆ هـەولـێـر
لـەلای (شـێـخ بـەشـیـر) هـەیـە خـێـرو بـێـر
گـوتـی چـووپـێـیـە بـۆ دیـاریو سـەوقـات؟
مـریـد بـۆ مـورشـیـد دیـاری هـەردەبـات
گـوتـمـان پـێـمـانـە کـاوڕو مـاسـتـی بـاش
نـانـی خـانـەقـا کـەس نـایـخـوا بـەلاش
بـانـگـی کـرد ئـازاد بـێـنـە سـەیـارە
دەبـێ سـواریـان کـەیـن چـارمـان نـاچـارە
سوار بووین پێنج نـەفـەر لـەبـۆ شـاری کورد
ئـازاد گـالـی دا کـردی دەسـتـوبـرد
تـا شـاری هـەولـێـر فـڕی وەك شـەمـاڵ
شـووتـیـن خـوارد لـەسـەر ئـاوی (گـۆمـەتـاڵ)
کـە گـەیـنـە هـەولـێـر بـوو بـە ڕاو تـەدبـیـر
گـوتـمـان لـەپـێـشـدا مـالـی شـێـخ بـەشـیـر
چـویـن لـە دەرگـان دا کـەس نـەبـوو لـە مـاڵ
دانـنـان کـاوڕو مـاسـت لـە خـانـووی بـەتـاڵ

ئـــەوجـــار ڕوون کـــردە شـــاری دارەتـــوو
لای مەلای دەلگەی خۆش خـولـقـو خـۆش خـوو
زیـــڕەمـــان هـــێـــنـــا لـــە زەنـــگـــی خـــەبـــەر
(حـــوســـێـــن) ی کـــوڕی فـــەوری هـــاتـــە دەر
پـــرســـیـــارمـــان لـــێـــکـــرد بـــاوکـــت لـــە مـــاڵـــە
ولامـــی داوە ئـــەو خـــۆش جـــەمـــاڵـــە
فـــەرمـــوون وا بـــاوکـــم لـــە ژووری مـــاڵـــە
لـــە دووری ئـــێـــوە زۆر پـــەشـــێـــوحـــاڵـــە
هـەر کـە ئـێـمـەی دی مـامـۆسـتـای دەلـگـە
فـەرمـووی لام نـەمـا بـەهـانـەو بـەلـگـە
بـەڕاسـتـی شـاد بـووم بـە هـاتـنـی ئـێـوە
پـێـم وەك دۆزەخـە ئـێـرە بـێ ئـێـوە
کـردتـانـە بـەهـەشـت دارەتـوو لـە مـن
دۆسـتـو شـاد کـردم، کـوێـروکـرد دوژمـن
مـەلای قـەمـتـەران وەك عـادەتـی زوو
لـەبـۆ خـانـەخـوێ دیـاری خـۆی پـێ بـوو
فـەرمـووی کـێ بـانـگ کـەم لـە مـامـۆسـتـاکـان
کـێ تـان پـێ بـاشـە بـیـهـێـنـمـە لاتـان
گـوتـمـان ئـەو کـەسـەی کـەخـۆت پـیـت بـاشـە
(مەلای مام قـاسـمـە) و (عـەبـدوللا) ش بـاشـە
کـە تـەشـریـفـیـان هـات ئـەو مـامـۆسـتـایـە
زۆر کـەیـفـخـۆش بـوون پـڕ بـەو دنـیـایـە
حـاجـی مـامـۆسـتـای گـونـدی قـەمـتـەران
بـۆلای شـێـخ بـەشـیـر کـەوتـە هـەولـدان

مــەلای بــاداوەی بــوو بــە هــاوســەفــەر
چون حـاجـی بـیـانـبـا بـە سـواری قـەمـەر
لــە پـاش دووسـەعـات هـاتـنـەوە لامـان
ســەلامــیــان کــردو تــێــکــەوە ڕامــان
بـۆخـاوەن دیـاری لـە بـۆ نـوێـژ بـەرمـاڵ
جـووتـە نـەعـلـەکـەش حـاجـی بـردیـە مـاڵ
مـامـۆسـتـا ڕەسـووش بـێـبـەش مـایـەوە
بــە کــڵاویــش ئــاوڕیــان وێ نــەدایــەوە
سـاقـی بـەسـیـەتـی ئـەو جـامـەی پـڕ کـە
بــەخــۆشــی یــاران تــەواوی فــڕ کــە
بـەڵام سـەد دەخـیـل ئـاگـات لـەخـۆ بـێ
بـا پـێـنـەزانـێ (مـەلای چـۆم خـڕکـە)
بـەیـانـیـش لـەدوای خـواردنـی نـان و چـا
بـەرەو لای ئـەوقـاف پـێـمـان پـێـوە نـا
بـۆ شـاری هـەولـێـر کـردمـان حـەرەکـەت
یـالـلا شـێـخ بـەشـیـر بـنـێـری بـەرەکـەت
سـایـەق قـوڕئـان خـوێـن نـەفـەر مـەلا بـوون
لـەسـەر پـارەی ڕێ تـووشـی هـەرا بـوون
لـە ئـەمـانـەی عـام گشت هـاتـیـنـە خـوار
لـیـسـتـەیـان نـووسـی مـەلا بـۆ دیـنـار
یـازدەیـان نـووسـی مـەلا لـە دەفـتـەر
لـەنـێـویـانـدا بـوو خـادیـمـێـکـی کـەر
لای (حـاجـی عـومـەر) ڕانـبـوارد بـەخـۆشـی
(شـلـمـاشـی) هـەر بـەو دێـت فـەرامـۆشـی

لـە هـەمـووان خـۆشـتـر کـا (مـەلا ڕەحـمـان)
خـۆش بـێ لـە گـونـاهـی خـودای بـێ مـەکـان
ڕۆلـەی هـەلـکـەوتـووی (مـەلای گـەنـاوی)
هـــەزاران ڕەحـــمـــەت لـــە دایـــكو بـــاوی
تـــەشـــریـــفـــی هـــاتـــە لای حـــاجـــی عـــومـــەر
لـــەدڵـــی ئـــێـــمـــەشـــی وەدەرنـــا کـــەســـەر
ئـافـەریـن شـاگـوڵ بـۆ خـونچـەی جـوانـت
بــۆ ئــەو نــەمــامــی بــاخو بــێــســتــانــت
شـێـخ لـە مـاڵ نـەبـوو چـوو بـۆ تـەنـفـیـزی
نــەنــدی جــەنــابــی بــێ دەعــیــەو فــیــزی
وەختێك مـەئـیـووس بـوویـن لـە زیـارەتـی ئـەو
ڕۆژی ڕوونـــاکـــمـــان لـــێ گـــەڕا بـــە شـــەو
نـــوێـــژی نـــیـــوەڕۆ جـــەمـــاعـــەتـــمـــان کـــرد
بـــەنـــانو مـــاســـتـــاو قـــەنـــاعـــەتـــمـــان کـــرد
ئـــەوجـــار هـــاتـــە قـســـە مـــەلای قـــەمـــتـــەران
بـا بـچـیـنـە زیـارەت (شـێـخ عـەولای خـەلان)
ســـەیـــارەمـــان گـــرت ڕۆیـــی وەك شـــەمـــاڵ
بـــەلام داخـــەکـــەم شـــێـــخ نـــەبـــوو لـــە مـــاڵ
ئـاوی سـارد هـاتو چـای دیـشـلـەمـەی جـوان
جـا وەرە فـڕکـەن عـەبـدولـلاو ڕەحـمـان
نـانـیـان بـۆ هـێـنـایـن کـەشـکـەکـی ڕۆنـدار
کـاك مـەحـمـود خـواردی هـەیـدادو هـاوار
ئـەوجـار لـەبـۆ لای (کـەرگـۆسـك و خـەبـات)
خـودایـە بـە ڕەحـمـەت بـمـانـدەی نـەجـات

لای (شـێخـی چـۆلـی) چـووینـە نـەقـلـیـات
(ئـالـلا) لـەوێ بـوو شـیـریـن وەك نـەبـات
بـەدیـتـنـی ئـێـمـە شـاد بـوو عـەیـنـی گـوڵ
خـەمـوپـەژارەی نـەمـا لـەسـەر دڵ
پـاش چـاکـوخـۆشـیو ئـەمسـەرو ئـەوسـەر
کاك (ڕەسووڵ مەحموود) فـکـری کـەوتـە سـەر
فـەرمـووی بـێـگـارم بـۆ بـەجـێـمـاوە
کـار کـاری کـوڕەو بـاب تـێـوەگـلاوە
کـاروبـارەکـەم گـش لـەسـەر جـەمـە
هـەر لـەسـتـۆی خـۆمـە خـواردنـی ئـەو خـەمـە
ئـیـجـازەمـان دا بچـتـەوە لای مـاڵ
ئـێـمـەی بـەجـێ هـێـشـت تـەنـیـاو بـێ هـەواڵ
ئـێـمـە کـەرگـۆسـكو ئـەویـش حـاجـیـاوا
لـەلای شـێـخ چـۆلـی کـردن مـالـیـاوا
چـوویـنـە کـەوەرگـۆسـك لای مـەلازادان
ساردیـیـان بـۆ هـێـنـایـن کـوڕانـی (وەسـمـان)
دووکـان بـە دووکـان بـۆی وەسـەرکـەوتـیـن
تـا مـالـی خـوارزای لـەگـەڕ نـەکـەوتـیـن
(مـەلا ڕەحـمـانـی خـدری پـور زێـنـەب)
لـە مـالـێ نـەبـوو زۆر سـەیـرو عـەجـەب
(حـاجـی عـەبـدولـلا)ش لـەرزو تـای لـێـبـوو
شـاهـیـدی هـەبـوو لـێـفـەی لـەوێ بـوو
سـەرو شـەربـەتـیـان هـێـنـاو پـێـنـدا کـرد
دنـیـا هـەرئـاوا هـات و واش ڕابـرد

ئـای لـەو گـەرمـایـەی بـێ حـەدو سـنـوور
تـیـنـی تـاو عـەیـنـی بـڵـێـسـەی تـەنـدوور
بـەقـرچـەی گـەرمـای نـاوەنـدی تـەمـموز
بـەرد ئـاگـر دەگـرێو دەبـێ بـە خـەڵـووز
ڕەشـەبـاش پـێـی بـوو مـزگـێـنـیـی گـەرما
دەیـگـوت کـێ هـەیـە خـۆم لـە قـەرەی دا؟
خـانـەخـوێـی شـەومـان (فـەقـێ ڕەسـوولـە)
لای دۆسـتو ئـەغـیـار قسـەی قـبـوولـە
یـاخـوا هـەربـژی کـوڕی واپـیـتـۆڵ
بـۆ کـاری چـاکـە هـەڵـی کـردوە قـۆڵ
دەعـوەتـی کـردن عـەبـدوڵـلاو ڕەحـمـان
یـانـی هـەر ئـەو دووە لـەگشـت مـەلاکـان
ئـەو شـەوەش لـەوێ خـۆشـمـان بـردە سـەر
دوایـە بـۆ هـەولـێـر ڕێـگـەن گـرتـە بـەر
ڕێـگـەمـان گـۆڕی بـەنـیـازی سـەیـران
کـەوتـیـنـە بـنـارو دەشـتـی (شـاخـۆلـکـان)
دەشـتـە جـوانـەکـەی جـەژنـەکـانـمـان دی
کـاولـە ڕووخـاوی مـالـەکـانـمـان دی
(بـەحـرکـە) و (سـێ بـێـر) گشـت (بـەڕانـەتـی)
وەخـتـێـك کـانـگـە بـوون بـۆ مـەردایـەتـی
هـەزار مـاشـەڵـلا خـوایـە لـە کـارت
چـەن جـوانو بـەرزن هـەمـوو ئـاکـارت
ئـەو دەشـتـی واجـوان تـا بـڕ دەکـا چـاو
نـە چـۆمـی لـێـیـەو نـە سـەرچـاوەی ئـاو

ئـەوجـار سـەرلـەنـوێ شـارەکـەی هـەولـێـر
لای شـێـخـی شـێـخـان مـەکـۆی خـێـروبـێـر
یـالـلا یـا سـولـتـان یـا سـەعـدی وەقـقـاز
کـارمـان تـەواو بـێ بـگـەیـنـە دلـخـواز
زیـارەتـمـان قـبـووڵ پـڕ خـێـروخـۆشـی
لـوتـفو ڕەحـمـەتـی دنـیـای داپـۆشـی
لسـتـەیـان دا دەسـت بـۆ ئـیـمـزا کـردن
لـە بـەحـری بـێ ئـاو مـەلـەی پـێـکـردن
بۆ هێندێك قبووڵ بۆ هێندێك مەمنووع
بـۆ هـێـنـدێـك وەعـدەی مـەعـاشـی مـەقـتـووع
بـا (شـێـخ فـەتـاح) یـش نـەچـێ لـەبـیـرمـان
پـێـشـوازی کـردیـن هـات بـەرەو پـیـرمـان
ئـەی (خـدرە قـەرە) ی بـە شـووتـیو گـنـدۆر
دوکـان ڕازاوەی بـە هـەزاران جـۆر
بـژی کـاك خـدری ئـەسـڵـە مـەمـیـشـە
پـیـاوەتـیـی بـۆتـە عـادەتو پـیـشـە
دوای نـانو کـەبـاب مـەلای قـەمـتـەران
ئـیـجـازەی وەرگـرت لـە هـەمـسـەفـەران
ئەویش جێی هێشتین وەك ڕەسوڵ مەحموود
چـۆوە قـەمـتـەران مـەکـانـی مـەقسـوود
حـاجـی مـەحـمـودمـان کـێـشـای ددانـی
دایـنـا نـۆ دیـنـار بـۆ عـەیـنـەکـانـی
ئـەوجـار نـەقـڵـیـات خـۆت بـگـرەو هـاتـم
بـەرەو حـاجـیـاوا کـانـگـای خـەبـاتـم

خــوایــە بــرژێــنــە ســەلاتو ســەلام
ســەر ڕوحــی پــاکــی پــێــشــەوای ئــیــسـلام
واخــەلاســم کــرد ئــەو ســەفــەر نــامــە
کــە وەك ســەفــەری حــیــجــازو شــامــە
لــەبــیــســتو چــواری حــەوتــی نــەوەد دا
هــەزاری زیــادبــوو لــەگــەڵ نــۆســەد دا
ڕۆژی ســێ شــەمــمــە چــواری لای عــەســر
تــەواو بــوون شــیــعــری هــاو وەزنــی نــەســر
بــرام بــا بــەس بــێ حــیــلــەو فــڕوفــێــڵ
بــابــەس بــێ قســەی بــێ تــام و بــێ وێــڵ
تــاکــەی غــافــڵــیو مــەســتــی شــەرابــی
تــاکــەی نــەزانــی بــۆچ حــاڵــی نــابــی
هــەســتــە وەك مــەردان بــگــرە ڕێــی چــاکــە
داوای نــەجــات بــوون هــەر لــە خــودا کــە
ڕێــگــەی ڕاســت بــگــرەو لادە لــە چــەوتــی
بــۆ بــۆ کــاری بــەد وەك ئــاگــرو نــەوتــی؟
زۆر ئــامــۆژگــاریــی بــە کــەڵــکــیــان کــردی
نەتبیست چوون شەیتان لە خشتەی بردی
کــاکــی شــاعــیــری پــیــری پــەڕکــەوتــە
جــێــی تــۆ خــانــەقــاو تــەکــیــەو مــزگــەوتــە
نــەکــەی دەخــیــلــە لــە ڕێــی حــەق لادەی
عــومــری ڕابــردووت هــەمــووی بــەبــا دەی
ئــەوا فــەرزم کــرد گشــت دنــیــا گــەڕای
چــوویــە ســەرمــانــگو لــەو دنــیــاش ڕامــای

گـەر خـوانـاس نـەبـیو نـەتـبـێ کـاری چـاك
وەك سـەگـی گـەڕۆك خـۆت دا بـە هـیـلاك
ئـای قـوڕ بـەسـەری پـیـاوی هـیـچ نـەزان
کـە وەك (فـاتـیـحـی) وێـڵـەو مـاڵ وێـران

**١٩٩٠/٧/٢٥ حاجیاوا**

# سەفەرنامە

## (٢)

**بەهاری ساڵی ١٩٨١ لە خزمەت (مامۆستا مەلا نەجمەدینی کەوکەبی و مەلا ڕەسووڵی نەوزادی و بایزە قیچ و عوسمانی کوڕی مامۆستا نەجمەدین) و چەند نەفەری دیکە چووینە فاتیحە خوانی (سەلیم ئاغا)ی ئاڵوەتان لەوێش ڕا چووینە دەفتەری سیاسیی حزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران. لە میراوێش (مەلا خدر) مان ڕەگەڵ کەوت. جامنیش ئەو سەفەر نامەیەم لەو بارەدا نووسی و چوومە چەند شوێنی دیکەش باسم کردوە.**

ئـــەی کـــیـــژۆڵـــەی بســـك لـــوول
دڵ بـــۆت دەکـــا شـــوولـــە شـــوول
(مـــەلا خـــدر) و کـــاك (ڕەســـووڵ)
دەســـتـــیـــان کـــرد بـــە قـــوولـــە قـــوول

(نـــەجـــمـــە) و (وەســـمـــان) بـــە جـــووتـــە
کـــاك (بـــایـــز) و (خـــدرە پـــووتـــە)
(ڕەحـــمـــان) دەڵـــێـــی بـــزووتـــە
بـــۆکـــوێ دەچـــی لـــە دووتـــە

(مـــام حـــەســـەنـــی نـــێـــوەژی)
لـــێـــم بـــۆتـــە ڕۆنو ڕەژی
درێـــژە وەك کـــۆڵـــەوەژی
کـــوانـــێ لـــە بـــرســـان دەژی

دەچمە دەفتەری سیاسی
بێ گوناهم چەشنی ماسی
(دکتۆر ڕەحمان) دەمناسی
زۆر خۆشە قسەو باسی

لە لای (نواوە) و (شیوەجۆ)
سوێندەکە بەسەری تۆ
دەستم کرد بە هاتوچۆ
ئەو کوڕە پەیدا نەبۆ؟

خۆشە لای (ڕەسووڵ گەردی)
دەدوێ گەلێك بە مەردی
ئای لە هەناسەی سەردی
دەری خست ئاهو دەردی

ڕێکخراوەی قەلاتە ڕەش
گۆشتی لێ کرا دابەش
کردیانە فێڵو گەردەش
نەیان دا بە گەردی بەش

چوومە مالی (دۆنەخۆر)
لەماڵ نەبوو چەکمەبۆر
هەر کوردە قەومی خۆخۆر
یەکن ڕەشو سپیو بۆر

چوومەلای (ڕەسووڵ گەردی)
لەمالێ نەبوو نەمدی
لەدەستی نەدا نەردی
کەوتەسەر ڕێگەی مەردی

(سۆغانلوو) و (کاسەکەران)
ناخۆشن بۆ سەفەران
خزمن لەو دەوروبەران
فێرنین بچنە هەندەران

کە گەیمە لێڕەواری
ڕۆژم کەوتە نەدیاری
کردم بەشینو زاری
بارانی ڕەحمەت باری

دیسان چوومە (میراوە)
بۆ وێ قەرارمان داوە
مامۆستا گوێی ئێشاوە
هەر (بایزە قیچە) ماوە

لە (ئالوەتان) و (مردواو)
ڕەشەبای هەلکرد بەتاو
(قالە شینە) نێرە پیاو
کردیە هەللاو قاوەقاو

ئەوە بوو سەفەر نامە
وەکو سەفەری شامە
هەرچی نەتبێ حەرامە
خۆش بوو (حەمە زەلامە)

(بەری مێرگان) تا (گولفەت)
دلی لاویان کردم لەت
کەوی کوێستان ڕشتیان خەت
بەختەکەم نەیهێنا قەت

ئەو سەفەرەم پێکەوت
گولەسوورەم دەست کەوت
لێم چنی شەشو حەوت
چ بکەم دڵ نابێ زەوت

(مەلا ڕەسووڵ) پەیدا بوو
بە درەنگەوە نەك بەزوو
ئەویش کردیە هاتوهوو
(مامۆستا) مان لەکیس چوو

ئای لە (ئەحمەدە لەتکە)
مەندیلی لە ملی پەتکە
لادە لەو کارە ئەتکە
ئەوکارە لەخۆت ڕەت کە

(دۆلەگەرمی) و (چالەوان)
هەر ئەوانن پالەوان
(واوان) ە جێگەی ئەوان
خۆشە جێ خەویان شەوان

ئەوەتا (خالید تەتەر)
وەدەریان نا بۆ سەفەر
حالی نەبوو قوڕبەسەر
لە ولات کرا دەربەدەر
١٩٨١/٦/٢٢

---

دکتۆر رەحمان: مەبەست شەهید دکتۆر عەبدولڕەحمانی قاسملوویە.

( ٣ )

# سەفەرێکی سەیرو خۆش

لــە ڕۆژی جــومــعــەی چــواری حــەفــتــاوســێ
سـی مـانـگـی مـەولـوود، هـەسـتـام کـەوتـمـە ڕێ
بــۆ (شــێــخ ئــاودەلان) ڕێــگــەم گــرتــەبــەر
کـوڕی (ئـالـلای بـاپـیـر) پـێـی بـوو کـوڕی کـەر
ســواربــووم لــە یــەســتــر کــەوتــیــنــە هــەوراز
دەســتــمــان بــەقسـان کــرد شــیــرنو مــومــتــاز
ڕۆیشـــتـــیـــن هـــەتـــا گـــەیشـــتـــیـــنـــە دێ
لـــەوێ دابـــەزیـــم ڕووم کـــردە حـــوجـــرێ
چـــووم ســـەلامـــم کـــرد لـــە فـــەقـــێـــیـــەکـــان
ســـەمـــاوەر دەکـــولـــیو ڕاخـــرا ســـفـــرەی نـــان
پـاش چـاكوخـۆشـیو پـرسـیـنـی ئـەحـواڵ
گــوتــیــان مــامــۆســتــا تــازە چــۆوە مــاڵ
لـــەدوای نـــانو چـــا کـــاك حـــاجـــی مـــەلا
بــە مــەنــدیــلــی ســیــپــیو شــاقــەڵو عــەبــا
فــەرمــووی دەی یــالــلا بــا بــکــەویــنــە ڕێ
چـوار نـەفـەر، مـن یـەك ئـەوانـیـش هـەرسـێ
کـاك (مـەلا عـەلـی) و کـاك (مـەلا ڕەحـمـان)
بــە (قــەلاتــە) داو (ســەرچــاوەی گــیــپــکــان)

بـــە لابـــەلایـــداو (گـــۆم وەســـتـــا عـــەلـــی)
بـــانـــگـــی کـــرد مـــارە کـــاك مـــەلا عـــەلـــی
مـــار چـــۆ بـــن بـــەردێـك دەورەمـــان لـــێـــگـــرت
شـــاخو ڕەهـــۆڵ بـــوو حـــەشـــاری هـــەلـــگـــرت
ڕۆیـــن تـــا گـــەیـــنـــە گـــونـــدی (شـــیـــوەڕەز)
لای (مـــەلا ڕەســـووڵ) کـــەس نـــابـــێ وەڕەز
ڕوون کـــردە حـــوجـــرە جـــێـــگـــەی فـــەقـــێـــکـــان
ســـەمـــاوەر ســـازبـــوو چـــادان، ئـــیـــســـتـــیـــکـــان
هـــەر کـــە ئـــێـــمـــەی دی کـــاك مـــەلا ڕەســـوڵ
لـــەگـــەڵ فـــەقـــێـــکـــان هـــات بـــە جـــوولـــەجـــووڵ
چـــاپـــەز چـــای تـــێـــکـــرد ســـاقـــی مـــەی هـــانـــی
مـــیـــوان جـــامـــی مـــەی فـــڕکـــرد بـــە جـــوانـــی
لـــە دوای چـــاخـــواردن مـــەلاو فـــەقـــێـــکـــان
ســـاز بـــوون کـــەوتـــنـــە ڕێ بـــەرەو (جـــۆلانـــان)
لـــە دێ دەرکـــەوتـــیـــن بـــوویـــن دەســـتـــەدەســـتـــە
لـــە ڕەزی (شـــێـــخـــی) دیـــن (عـــەولا ســـســـتـــە)
چـــاکـــوخـــۆشـــیـــن کـــرد لـــەدوای ســـەلامـــی
زانـــیـــن مـــیـــوانـــە لـــە مـــالـــی مـــامـــی
کـــاك مـــەلا ڕەســـوو عـــەولاو کـــاك حـــەمـــە
حـــەوت نـــەفـــەر کـــردن بـــە گـــالـــتـــەو گـــەمـــە
لـــە پـشـــت جـــۆلانـــان کـــاك (حـــاجـــی حســـێـــن)
ســـواری یـــەســـتـــر بـــوو لـــەگـــەڵ چـــاو شـــەهـــێـــن

پرسیارمان لێکرد هیچ فەقێ و مەلا
نەتدیتن لەڕێ بڕۆن لابەلا
گوتی لە مالی (خدری مەلاحمەد)
دانیشتبوون مەلا بێ ژمارو حەد
ڕوون کردە هۆدەی پڕ مەلاو فەقێ
وەرە لە خۆشیان دلت نەتەقێ
کاك خدر بەغار هاتەپێشوازن
فەرمووی نان و چا هەردووکیان سازن
کترێو سەماوەر قولتە قولتیان بوو
وەکو پیاوی پیر فلتە فلتیان بوو
مامۆستای (مێرتکە) و ئیمامی (دێلۆ)
کاك مەلاخدریش یەکی لەگەڵ بۆ
(حەسەن) چای تێکرد نۆشین سەرو چا
شەش مەلا، فەقێ، پێنج گرتن ڕێگا
کەوتینە ڕێگا بە بەزم وهەرا
(کوێخای میران) چۆ لای حاجی مەلا
ئێمەش بە سەیرو هەللاو گۆرانی
بەسەر (کووران) داو (قەبری عوسمانی)
ئاوا بووین ڕۆیین دەم بەقسەو باس
سێ سوار دەرکەوتن پێیان بوو ڕێواس
پاش دەس ماچکردن من چۆنو تۆ چۆن
گوتیان مامۆستا ڕێواسان ناخۆن؟

زۆرمان پێخۆش بوو ئەو دەنگو باسە
هێندمان ڕێواس خوارد نەمان ما تاسە
هەزار ماشەڵڵا لەو چەقەچەقە
قەسیدەمان خوێند هەتا (گاڕەقە)
لە (خڕی دووبە) لەو سەرچۆمی لێژ
عەسربوو هەموو لەوێ کردن نوێژ
پاش نوێژ بۆ پەرتە وەك كەووباڕ
بلاو بووین گرتن پانایی (گۆجاڕ)
تاق تاقو جووت جووت ئازاو شلو توند
گەینە لابەلاو وەدەرکەوت گوند
یانی (گەلوەڕەز) (کانیەڕەش) (سونە)
بەرامبەر (سادر) و (گوێزەو سوێسنە)
هەتا کن قەبران قەراخی مالان
کاك حاجی مەلاو مامۆستای ئالان
هاتنەپێشوازن پاش چاکوخۆشی
ڕوون کردە مالان دەستمان داپۆشی
کاك حاجی مەلا هات وەپێش کەوت
ڕێگای نیشان داین هەتا مزگەوت
ئەهلی ئاوایی بەخسوس حاجیەکان
زۆر کەیف خۆش بوون بە ئێمەی میوان
ئەو شەوە ڕانبوارد بە سەیرو سەفا
بۆ نووستن وەختێ کە جێ ڕاخرا

یـــەك یـــەك و دوو دوو كـــەوتـــیـــنـــە مـــاڵان
چـــۆ دیـــوەخـــانـــە مـــامـــۆســـتـــای ئـــاڵان
ئـــەو شـــەوەش نـــووســـتـــیـــن هـــەتـــا بـــەیـــانـــی
لـــەپـــاش نـــوێـــژانو لـــەدوای چـــاو نـــانـــی
گـــوتـــمـــان ئـــەمـــڕۆكـــە دەیـــكـــەیـــنـــە گـــەردەش
مـــلـــمـــان پـــێـــوەنـــا بـــۆلای (كـــانـــیـــە ڕەش)
روون كـــردە مـــاڵـــی كـــاك (ئـــەحـــمـــەدە ســـوور)
ڕێچـــكـــەمـــان لـــێـــبـــەســـت بـــەدابو دەســـتـــوور
لـــەدوای ســـەلامو مـــن چـــۆنو تـــۆ خـــاس
گـــوتـــیـــان چـــای دەخـــۆن یـــا بـــیـــنـــیـــن ڕێـــواس
ڕێـــواســـیـــان هـــێـــنـــان بـــەتـــێـــڕو بـــە بـــار
كـــەمـــێـــكـــمـــان خـــواردو ئـــەویـــدیـــش خـــەســـار
بـــەگـــورگـــە لـــۆقـــەو بـــەهـــەلـــبـــەز هـــەلـــبـــەز
تـــێـــهـــەلـــبـــووین بـــۆلای گـــونـــدی (گـــەلـــوەڕەز)
بـــەچـــەشـــنـــی بـــەهـــەشـــت پـــڕ قـــومـــریو چـــنـــوور
بـــاخ وگـــولـــزاری لـــەو دۆڵـــە مـــەشـــهـــوور
عـــەرعـــەرو ســـەروو گـــوێـــزو بـــیو چـــنـــار
كـــۆخو هـــەنـــجـــیـــرو بـــێو قـــەیـــســـیو هـــەنـــار
هـــەلالـــەو ســـوێـــســـنـــە وەنـــەوشـــە گـــیـــابـــەنـــد
نـــەك دلـــێـــك ســـەد دڵ لـــەوێ دەبـــوو بـــەنـــد
بـــەتـــایـــبـــەت ئـــاشـــی كـــاك (مـــەحـــمـــودە ســـوور)
تـــەقـــەی چـــەقـــەنـــەی وەك ســـازو ســـەنـــتـــوور

چێشتانە چامان هاویشتە ئاشی
کاك ئەحمەدەسوور تێیکرد باراشی
ئەوجار لەسەر ڕا هاتینەوە خوار
وەك بزن وەربێ بەنێو لێڕەوار
کاك (مەلاخدر) و (کەریم) و (ڕەحمان)
چوون لە بۆ مالی (ڕەسوی خاڵ وەتمان)
بەتالووکە بووین هەستاین دەستوبرد
چووینەلای ئەویش تاتی ساز دەکرد
سەلامن لێکرد هەرسێك بەجارێك
بۆ مەلا خدر داوان کرد دارێك
وتی بە چاوان من مالم نییە
ماڵ بۆ ئێوەیە جا دارێك چییە
پاشان مەلاکان هەموو هەلڕژان
چیمپەست دانیشتین پڕبوو دیوەخان
ئەوانیش سەرو چایان پێدا کرد
(کوێخای میرانیش) داری پەیدا کرد
ئەوجار هەموومان هاتینەوە خوار
نوێژن کرد هەموو سەرفن کرد نەهار
ئەوجار مەلاکان کەوتنە ڕێ بۆ ماڵ
منیش مامەوەو کاك (حەمە)ی هاواڵ
(مەلاکەریم) و کاك (مەلاعەولا)
ساز بوون بۆ زێوکە لای (کوێخا عەولا)

ڕۆیشـــتـــیـــن هـــەتـــا کـــانـــی (بـــەردقســـڵ)
پـــەیـــدا بـــوو لـــەوێ (نـــاز) ی ســـوورەگـــوڵ
بـــۆنـــی مـــێـــخـــەکـــەو عـــەتـــرو ســـابـــوونـــی
دەرمـــان بـــوون لـــەبـــۆ دەردە تـــاعـــوونـــی
بـــەقســـەی خـــۆش ڕۆیـــیـــن تـــا گـــەیـــنـــە مـــالان
لـــە (پـــردی قـــوڕێ) دڵ چـــوو بـــەتـــالان
بـــە دووعـــاو نـــووشـــتـــە یـــالـــلا یـــا جـــەلـــیـــل
کـــەوتـــیـــنـــە فـــکـــران بـــۆ (ئـــەحـــمـــەد خـــەلـــیـــل)
(مـــام مـــەلا) ن بـــانـــگ کـــرد چـــووینـــە ســـەرچـــاوە
خـــەریـــك بـــوو بـــار کـــا دلـــخـــۆشـــیـــن داوە
پـــاشـــان پـــێـــمـــان گـــوت کـــاك ئـــەحـــمـــەد خـــەلـــیـــل
ئـــێـــمـــەی ڕاســـپـــاردووەو کـــردوویـــنـــە وەکـــیـــل
مـــام مـــەلا وەك شـــێـــر نـــەڕانـــدی ئـــەمـــن
کچـــی خـــۆم نـــادەم بـــە پـــیـــاوی چـــڵـــکـــن
نـــە نـــوێـــژان دەکـــاو نـــە ڕۆژوو دەگـــرێ
بـــە خـــەیـــالـــی خـــۆی پـــێـــیـــوایـــە نـــامـــرێ
بـــە مـــەنـــدیـــلـــەکـــەی مـــەلای گـــۆڕەمـــەر
مـــارەم کـــردووە چـــوار ڕۆژ لـــەمـــەوبـــەر
کـــەوامـــان زانـــی ســـەرنـــاگـــرێ ســـەودا
بـــێـــدەنـــگـــەن لـــێـــکـــرد خـــۆمـــان لـــێ لادا
بـــەلام ئـــەوشـــەوە لـــەشـــکـــری کـــێـــچـــان
کـــەوتـــنـــە جـــولـــەو مـــەلا هـــەلـــپـــێـــچـــان

بــەیــانـــی خـــۆمو (حـــەمـــەی خـــالـــەڕەش)
ڕوون کــردە گـونـدی (بــەسـتـە) و (ئـالـیـەڕەش)
چـویـنـــە ئـالـیـــەڕەش لای (عـــەولای سـۆفـی)
بـــڕیـــمـــان ڕێــگــەی پــڕ پــێـــچو لــۆفـــی
لـەوێـش ڕۆیشـتـیـن نـەیـانـکـردیـن بـەنـد
ڕەگو ڕیشـەی دڵـی هـەڵـكـێـشـا (گـیـابـەنـد)
دەچـوو بـۆ كـوێسـتـان هـەواری (گـوێـزە)
لـە دڵـی حـەمـەی دا بـە نـووكـە نـێـزە
ئـەوجـار بـە دڵـێـكـی پـڕ خـەمو خـەسـتـە
بـوویـنـە مـیـوانـی مـامـۆسـتـای (بـەسـتـە)
(كـوێـخـا ئـەمـەر) و كـاك (سـەیـدی ورچـان)
پـێـیـان بـوو لـەوێ شـریـقـەو دەرمـان
كـاك (مـەلا ڕەسـوو)و (مـام حـاجـی گچـكـە)
سـێ مـاڵـیـان هـەبـوو عـەیـنـی سـێ كـوچـكـە
مـزگـەوتو مـاڵـی (حـاجـی مـام مـەلا)
جـارجـارەش سـۆفـی دەهـات لابـەلا
شـەوێـك ڕامـان بـوارد لـەو گـونـدە چـاكـە
ئـەلـحـەق مـام حـاجـی نـوورانـی و پـاكـە
سـۆفـیـەكـان لـەگـەڵ (حـاجـی سـولـەیـمـان)
چـوونـە (بـێـلـوولـە) لای (حـەسـۆ مـیـرخـان)
ئـێـمـەش ئـەو ڕۆژە لـەدوای نـیـوەڕۆ
بـۆ گـونـدی (سـونـێ) كـردن گـفـتـوگـۆ

لـــە گــەنـــمـــی شـــۆڕش پـــڕی کـــرد جـــەواڵ
کـــاك (مـــەلاڕەســـووڵ) بـــردیـــەوە بـــۆ مـــاڵ
ئـــەوجـــار هـــەڵســـتـــایـــن بـــە بـــارگـــەو بـــنـــە
کـــەوتـــیـــنـــە ڕێـــگـــا بـــۆ گـــونـــدی ســـونـــە
کـــاك (حـــاجـــی مـــەلا) پـــاش پـــیـــواز ئـــاودان
بـــردنـــیـــەوە مـــاڵ مـــەلای دە مـــیـــوان
هـــەزار ئـــافـــەریـــن شـــاگـــولـــی مـــامـــەش
حـــاتـــەم لـــە ڕاســـتـــت فـــەقـــیـــرە و بـــێـــبـــەش
زۆر بـــە ڕووخـــۆشـــی خـــزمـــەتـــی کـــردیـــن
خـــەمو پـــەژارەی لـــەدڵ لابـــردیـــن
ئـــەو شـــەوەش لـــەوێ خـــۆشـــمـــان ڕابـــوارد
بـــەیـــانـــی وەخـــتـــێ کـــەنـــانو چـــان خـــوارد
خـــەریـــك بـــوو بـــکـــەیـــن شـــەرعـــی (مـــام وەتـــمـــان)
هـــاتـــنـــەژوور (حـــەســـەن- ڕەســـوڵ و ڕەحـــمـــان)
گـــوتـــیـــان مـــامـــۆســـتـــاو کـــاك ســـەیـــد ئـــەتـــۆ
وەرنـــە (بـــێـــلـــوولـــە) بـــۆلای کـــاك (حـــەســـۆ)
وەپـــێـــش خـــۆیـــان دایـــن بـــەبـــێ پـــســـوولـــە
زانـــیـــمـــان حـــەپـــســـیـــن جـــێـــنـــە بـــێـــلـــوولـــە
چـــوو (ئـــەمـــەر) بـــێـــنـــێ (ڕەســـووی خـــاڵ وســـوو)
بـــە (ســـەرخـــان)ێـــداو بـــە(ســـووری ڕووتـــوو)
چـــوویـــنـــە بـــێـــلـــوولـــەی پـــڕ هـــەورازو لـــێـــژ
لـــە (پـــردی خـــواچـــکـــە) هـــەڵـــمـــانـــگـــرت دەســـتـــنـــوێـــژ
خـــولاســـەی کـــەلام بـــوویـــنـــە زیـــنـــدانـــی

خــۆشــیو نــاخــۆشــی هــەر خــوا دەیــزانــی
خــانــوێــکــی نــەوی پــڕ لــە ئــەســپــێو کــێــچ
ســپــیــکــار نــەبــوو بــە گــڵــی ســپــیو گــێــچ
چــوارشــەو ڕامــانــبــوارد وەك شــێــری شــەرزە
پـــیـــاوی بـــێ خـــەتـــا نـــەبـــەزو بـــەرزە
لــەولاش کــاك ( حــەدداد) کــەوتــە هــاتــوچــۆ
ئـــاگـــاداری کـــرد ســـلـــێـــمـــانـــی و کـــۆ
کــولــێــرەی ڕەقو نــیــســك و مــاشــێــنــە
دەبــیــخــۆ فــەقــیــر عــیــلــلــەت پــەڕێــنــە
زیـــنـــدانـــی وایـــە هـــەردەنـــوێ و دەخـــوا
زیـــنـــدانـــیـــیـــش هـــەیـــە هـــەزار کـــار دەکـــا
بـــرام هـــەروایـــە دنـــیـــای بـــێـــوەفـــا
هـــەر ڕۆژەی جـــۆرێـــك نـــمـــایـــش دەکـــا
خـــودایـــە ئـــەو ڕۆژەی ئـــالای ولاتـــم
دەشـــەکـــێ لـــەســـەر لـــوتـــکـــەی قـــەلاتـــم
بــیــبــیــنــم بــەچــاو تــێــر تــەمــاشــای کــەم
لـــەدڵـــم دەرکـــەم کـــوڵو کـــۆ ســـەرجـــەم
لـــێـــت داوادەکـــەم لـــەبـــۆم بـــێـــتـــە بـــەر
وەحــەســێــم لــەبــنــی بــێ خــەم و کــەســەر
ڕۆژی مـــەش هـــەڵـــێ لـــە ئـــاســـۆگـــی گـــەش
گــەلــەکــەم چــیــدی نــەبــیــنــم بــێــبــەش
خــوایــە بــۆخــاتــری فــەخــری کــائــیــنــات
لــەدنــیــاو قــیــامــەت بــمــانــدەی نــەجــات

دوور بــیــن لــە فــیــتــنــەو عــەزابــی قــەبــری
دوور بــیــن لــەشــەیــتــان لــە حــیــلــلــەو مــەکــری
یــا (رســـول الله) دەخـــیــل ســـەد دەخـــیـــل
دەهـــاوارمـــان بـــێـــی ڕۆژی قـــالو قـــیـــل
خــۆش بــی لــە گــونــاه و خــەتــای (رەحــمــانــی)
(فــاتــیــحــی)م بــێــبــەش لــە زیــنــدەگــانــی
۱۹۷۳/٥/۲٤ **شۆڕان**

---

**لەڕۆژی جومعەی ٤ی ۷۳ : مەبەست ساڵی ۱۹۷۳ یە.**

# نەورۆزە شینە دەشت و دەر

بولبول وەرە بەهارە هات
بەهارە وەك دلدارە هات
باقەی گولان بە بارە هات
عەتری دوو زولفی یارە هات
گولزارو سەحراو دۆڵو دەشت
جوانی کرد بەهار وەك بەهەشت

❖❖❖

کێوو کەژو دەم چۆمو ئاو
شەبەق دەدەن لەگەڵ هەتاو
شەماڵە وا بە غارو تاو
دەپڕژێنێ شووشەی گولاو
بولبول لەسەر چڵ دەخوێنێ
قاسپەی کەوە شادی دێنێ

❖❖❖

زەردەی هەتاو دای لە زەوی
خۆشی کرد بلندو نەوی
گیا هاتە دەر لەبن کەوی
بەفر نەما، ڕۆیی، ڕەوی
وەنەوشە مل کەچ دێتەدەر
لەدەم چەم لادەبا کەسەر

ســـوێســـنـــەو هـــەلاڵـــەو ســـوورەگـــوڵ
ســـەریـــان هـــێـــنـــایـــە دەر لـــە گـــڵ
بـــولـــبـــول لـــە دەســـتـــیـــدایـــە گـــوڵ
ئـــاوازی دێ لـــــە پـــــۆپـــــی چـــــڵ
شـــەو تـــا بـــەیـــان هـــوشـــیـــارە ئـــەو
مـــەحـــبـــووبـــەکـــەی لـــەبـــارە ئـــەو

❖❖❖

بـــاخو چـــەمـــەن وەك بـــووكـــی ســـوور
لـــێـــی تـــێـــکـــەڵـــن لالـــەو چـــنـــوور
زەمـــیـــن گـــرتـــی بـــۆنـــی بـــخـــوور
گـــولـــڕەنـــگـــە ســـەحـــرا پـــڕ لـــە نـــوور
قـــازو قـــوریـــنـــگ بـــەقـــارەقـــاڕ
هـــاتـــن دەڵـــێـــن خـــۆشـــە بـــەهـــار

❖❖❖

خـــوڕەی بـــەفـــراوی ســـەرکـــەڵـــە
شـــەڕابـــی قـــومـــریـــیـــەو مـــەڵـــە
کـــاکـــەی شـــوان بـــە تـــووزەڵـــە
هـــەر چـــاوەڕوان بـــوو بـــۆ هـــەڵـــە
بـــێـــری بـــە لـــەنـــجـــەو لارەکـــەی
دەڕواتـــــەجـــــێ هـــــەوارەکـــــەی

ڕەشـــمـــاڵو هـــۆبـــە چـــوونـــە دەر
کـــوێـســـتـــان بـــەفـــری نـــەمـــا لـــەســـەر
نـــەورۆزە، شـــیـــنـــە دەشـــتو دەر
کـــوڕ لـــە کـــیـــژ دەگـــرن ڕێـــگـــوزەر
کـــوڕگـــەل نـــەمـــا دەورانـــی خـــەم
جـــێـــژوانـــە چـــۆڵو دۆڵو چـــەم

❖❖❖

کـــوردســـتـــان بـــەهـــەشـــتـــی زەوی
تـــەمو مـــژی لـــەســـەر ڕەوی
نـــەوی بـــوون بـــاپـــزوو و کـــەوی
شـــەمـــاڵ دای لـــە بـــڵـــنـــدو نـــەوی
کـــیـــژو کـــوڕو پـــیـــرو مـــنـــاڵ
گـــیـــاو گـــوڵـــی بـــەهـــار دێـــنـــنـــە مـــاڵ

❖❖❖

بـــۆ نـــیـــشـــتـــمـــان ســـووتـــاوە دڵ
بـــێ بـــاخـــەوانـــە بـــاخـــی گـــوڵ
بـــۆیـــە دەگـــریـــم بـــەتـــاوو کـــوڵ
زۆردار بـــەشـــی کـــرد ئـــاوو گـــڵ
(فـــاتـــیـــحـــی)م وەك چـــەقـــڵ دەچـــم
دەچـــاوی دووژمـــن ڕادەچـــم

**چەکۆ** ١٩٦٥/٦/٢٥

# پێڕست



**فایتیحی و عوسمانی وەجاخی**



**فاتیحی و نالی کوڕەزای**




**مامۆستا مەلا بایزی مەنگوڕ- فاتیحی**




**سۆفی عەلی چیانەیی - نزار کوێستانی - فاتیحی**